


ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: تۆڵە
ناوی نووسەر: محەمەد موکری
بابەت: ڕۆمان
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ پێنجەم ٢٠١٥
چاپخانە: پەنجەرە
تیراژ: (١٥٠٠) دانە
نرخ: (٥٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١١٨٦)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێ دراوە.



ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

(ئێستا) لەودیو ئەو زنجیرە چیا ڕووت و سەختەی بەرانبەرمە، لە پانتایی دە - دوانزە کیلۆمەتری چوارگۆشەیی، دووکەڵێکی ڕەش و سەخت بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێت...

(زوو، لەودیو ئەو زنجیرە چیا سەخت و ڕووتەی بەرانبەرمە، دێیەکی گەورەی لێبوو، کە زیاتر لە دوو سەد ماڵێکی گرتبووە خۆی...

ئەگەر دە ساڵێک لەمەوبەر، کەسێک لە نزیکەوە سەیری دێی کردبا، ئەوا یەکسەر مەلی دیدەی هەڵدەنیشتە سەر جوانترین شوێنی دێ، ئەویش مزگەوتێکی گەورەی لە کۆنکرێت درووستکراو، حەوز و ئاوێکی ڕوون، باغ و باغاتێکی زۆر ببووە پەرژینی دەوری مزگەوت و قوتابخانەکەی تەنیشتی... قوتابخانەکە تا پۆلی شەشی سەرەتایی تیا دەخوێندرا، هەروەها کەسەکە، یەک - دوو دووکانی وردەفرۆش و چاپخانەییێکی چکۆلەیشی دەبینی، چۆمێکی باریکیش دێیەکەی کردبوو بە دوو بەشەوە...

گەر کەسەکە بچووبایەتە نێو دێ، سێ - چوار مامۆستای گەنجی دەبینی( بە کوردی وانەیان بەو قوتابیانەش دەدا، کە لە(کوێرە دێ)یەکانی ئەو دەوروبەرەوە بۆ قوتابخانەی دێیەکە دەهاتن... گەر سەرێکیشی لە چاپخانە چکۆلەکە دابا و حاجی محێدینی نەدیبا بە قرەقڕ و دەنگی بەرز لەنێو چەند زەلامێکدا دامە دەکات، ئەوا فەتاحی سەکنی (کەریمی شۆفێری

دەبینی، بە هەموو تاقەتێکی خۆی پولەکانی دۆمینەی هەڵدەڕشتە سەر مێزەکە و ئەزنیفی دەکرد، سەعە سووری چاییش هەر لەسەر بۆڵەبۆڵی خۆی بەردەوام بوو، لە نێوانی دوو (ڕێکۆردە)دا سەری لێ تێک چووە، هەر دەیویست گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک بخاتە سەر نەوار و بە دوو قات بیانفرۆشێت...

خۆ ئەگەر (ئێستا) کەسێک لەم زستانە سەختەی ئەم ساڵەدا، بتوانێت بەسەر چیا ڕووتەکەی بەرانبەرم کەوێ، بەفر بشکێنێت و بچێتە سەرێ، لەوێوە سەیری دامێنی ئەودیو بکات، ئەوا یەکسەر لەنێو پەڵە دووکەڵە ڕەشەکاندا، چەندین داری بەرداری زەبەلاحی نیوە مردوو و سووتاو و ڕەشهەڵگەڕاو دەبینێت - کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بەردار، سەربەرز، خاوەنی خۆیان هەبووە - .

گەر بەفری چیاکەش کاری لە چاوانی کەسەکە کردبێت، بەزۆر هەندێک فرمێسکی لێدۆشیین، دەتوانێت دەست بە چاوانی خۆیا بێنێت، هەندێک بیان تروکێنێت، ئەوجا بۆ دوورتر بڕوانێت، ئەوا لە دووری پێنج سەد مەترێکی کەلاوە و دار و پەردووەکانی (دێیەکە) لە تەختە زەوییەکی بەباردا، پیردار بە ڕووییێکی کۆک، لق و پۆپ هەڵکشاو دەبینێت... تا دێ ئاوەدان بوو ( پیرە دار ناوی شێخ ڕەش بوو) ئێستاش ئەوە شەش حەوت ساڵێکە پێی دەگوترێ ( داری موختار)...

خۆ ئەگەر کەسەکە، لەسەر چیادا بحەسێتەوە و ماندوویەتی دەرچێت، ئەوجا بەڕوونی لە شوێنەواری (دێیەکە) ڕابمێنێت، ئەوا لەنێو بەفرە تازە باریوەکەدا، یەک - دوو شوێنی بۆر، کە پێنەئاسا لکاونەتە سەر زەوییە سپییەکە، لەنێو چاوانیدا لەنگەر دەگرن و دەوەستن، ئەو دوو شوێنەش، شوێنەواری مزگەوت بەدەنەمێت تەقێنراو و قوتابخانە سوتێندراوەکەی دێیە...

خۆ ئەگەر کەسەکە خەڵکی ئەو ناوچەیە نەبێت، ئەوا زۆر بەزەحمەت - لەو (بەرزییەشەوە) دەتوانێت شوێنەواری ئەو چەند کوێرە دێیە سوتێندراوانەی ئەو دەوروبەرە ببینێت... خۆ ئەگەر ئەوەندەی بوردی (دۆشکایەک) سەرنج هەڵبدات، ئەوا لە دووری دێ و لە تەختە زەوییەکی تەلبەندکراودا، دەیان موودەرەعە و سەیارەی سەربازی دەبینێت - هەندێکیان وەک خەڵووز ڕەش هەڵگەڕاون، هەندێکی دییان واژگوون بوون و شکێندراون، دەشێت تا ئێستاش هەر گڕیان لێ بەرز ببێتەوە... تەختە زەوییە تەلبەندکراوەکەیش لەنێو بازنەیێکی گردی زل زلدایە، قوتەکانیان (ڕەبایەی) داتەپیوی بەسەرەوەیە، ڕەش دەچنەوە! ڕێیەکی پێچاوپێچیش بە چەند کیلۆ مەترێک دێ دەبەستێتەوە بە شەقامی قیرتاوکراوەوە... شەقامی ڕەشیش وەک ئەژدیهایەکی بێگیان کەوتووەتە نێوان دوو زنجیرە چیای سەخت و ڕووت...

خۆ ئەگەر کەسەکە ڕوو وەرچەرخێنێت و بە دیوی لای مندا بڕوانێت، ئەوا لە دامێن و لەنێو هەندێک داری زل و شاشدا دەیان مرۆڤ دەبینێت، بە سەد مەترێک لە ژووروی ئەوانیشەوە (من) دەبینێت، لە پایینی گابەردێکدا ڕووەو چیا دانیشتووم... دەشێت کەسەکە بپرسێ (ئەرێ بۆ ئەو تاقە نەفەرە لەو دە - پانزە کەسە جیابۆتەوە و بە تەنها دانیشتووە؟ ( ئەڵبەتە ئەو نازانێ بۆ؟بەڵام من باسی دەکەم، بۆ دورەپەرێز دانیشتووم - پێش ئەوەی بێمە سەر باسەکە، دەپرسم: - ئەرێ دەشێ مرۆڤ کەڵکی ئەوەی هەبێت لە یەک کات و شوێندا، سەرکەوتنێکی گەلێک مەزن و کۆستێکی سەخت گەمارۆیان دابێت و بتوانێت تەحەموول بکات؟

پێویستم بە چ وەڵامێک نییە. پێشەکی دەڵێم (نا)، چونکە مرۆڤ لە سەرکەوتنی مەزن مەزنترە و خۆی خاوەنێتی (کۆستیش هەر چەندە ئەستوور و سەخت بێت، تینی هیوای ژیانویستی ڕایدەماڵێت...) (ئێستاش)

منم لەنێوانی ئەو دوو دژەدا نیمچە حەپەساوم!

خۆ ئەگەر کەسەکەی سەر چیا، چاو لەسەر من بگوازێتەوە، ڕووی بە ئاراستەی دێیە خاپوورکراوەکەدا وەرچەرخێنێت، ڕەنگە سووکە غەمێک بۆ ئەو دێیە سووتێندراوە بخوات - کە جێیەکەی چ لە جوانی و لە ئاو و هەواکەی لە بەهەشت کەمتر نییە.

***

من خەڵکی ئەو دێیەم، ناوم مستەفایە و زۆرجاریش پێم دەڵێن (مچە)... باوکم یەکێک بوو لەو جووتیارانەی ساڵی یەک - دوو جار هاتووچۆی شاری دەکرد... دایکم نەمابوو، باوەژنم هەبوو... من لەماڵی باوکم دەرکرابووم، لەماڵی (حەمە)ی خاڵۆمدا ژیانم دەگوزەراند...

باوکم دوو کوڕی دیشی لە باوەژنەکەم هەبوو، ئەحمەد ساڵێک و محەمەدیان دوو ساڵان لە من منداڵتر بوو، لە قوتابخانەدا برا بووین، بەڵام لە یەک ماڵدا نەدەژیاین، باوکم هەژارێکی تڕزلی نەخوێندەوار بوو، کەس نازانێت چۆن، یا کێ فێری ئەوەی کردبوو بتوانێت ناوی خۆی بنووسێت، شەش - حەوت دەقیقەی پێدەچوو تا ناوەکەی خۆی دەنەخشاند، وەک ئەوەی کارێکی گەورەی کردبێت، نووسینەکەی نیشانی خوێندەواران دەدا، خۆیشی لێی ڕادەما، جارجارەیش دەیگوت: (پەکوو، ناوەکەم چەند قوورسە!) کەچی خۆی بە زانایەکی زل دەزانی، پێی وابوو سەری لە هەموو عیلم و علومێک دەردەچێت، گەلێک شارەزا و پسپۆڕە، پێویست دەکات ڕاوێژی پێبکرێت... لە هەموو باس و خواسێکدا خۆی تێهەڵدەقورتاند، گەر عەقڵی هەر شتێکی نەبردبا، بێ سێ و دوو، بەرانبەر هەر کەسێک با، دەیگوت: (نەخێر... وا نییە، تۆ نازانیت) سەرباری ئەمانەش، ڕووخسارێکی پێکەنینئامێزی هەبوو، ئەندامەکانی

سەر و سەکووتی هیچیان لەگەڵ یەکدیدا نەدەگونجان: دوو چاوی ڕەش، برۆکانی هەند سفت و ئەستوور بوون، تەواو سێبەریان خستبووە سەر چاوە ڕەشەکانی، کە هەمیشە بە کل دەیانی ڕژت و دەیگوت: (سوونەتە!) سمێڵەکەیشی لە چەشنی سمێڵی هیتلەر دادەنا، خەنە و وسمەیشی تێدەگرت...

باوکم خوویەکی زۆر سەیری هەبوو، هەر بۆ ئەوەی پاکانە بۆ ڕەفتارەکانی خۆی بێنێتەوە، ئایەت و حەدیسی ئەوتۆی درووست دەکرد، وەک دەڵێن:(سەربەقوڕی پێدەهاتە پێکەنین) چەندین چیرۆکی دەستکردی خۆی بۆ (ئەسحابە و پیاوچاکان) درووست کردبوو، بەبێ هیچ مووناسەبەیەک، چیرۆکی بۆ ئەسحابەیێک درووست دەکرد و لەگەڵ گوفتارێکی خۆیدا دەیگوونجاند... باوکم هەمیشە مۆن بوو، هەر لە هیچە تووڕە دەبوو، دەنگی بەرز دەکردەوە، نەک تەنها لەگەڵ مندا - کە زۆری ئەزییەت دەدام و حەزی نەدەکرد بمێنێت، بەڵکوو لەگەڵ زڕبراکانم و هەموو خەڵکی دێیەکەشمان وابوو، کەچی سەری چووبا، نوێژی نەدەچوو، هەزار جنێوی بێسەروبەری بەو کەسانە دەدا کە نوێژیان نەدەکرد، وایدەزانی کلیلی دەرگای بەهەشت بەتایبەتی بۆ کەسانی دێ، لەلای خۆیەتی!

***

من (ئێستا)

لە پانای ئەم گابەردەیا دانیشتووم، چاوم بڕیوەتە چیا سەخت و ڕووتەکەی بەرانبەرم، دەروونم دەکوولێت، ج هەست بە جوولەی ئەو هاوڕێیانەی دەوروبەرم ناکەم - کە خۆیان لەبەر من - دوور گرتووە، نایانەوێت ئەم تەنهایییەم لێبشێوێنن... (ئێستا) کە بە چاوی دڵ سەیری

ئـەم کۆسـتە دەکـەم، وا دەزانـم مـن هـەر بـۆ کۆسـت لەدایـک بـووم. وەک دەگێڕنـەوە:

دایکم بەسـەر منـەوە چوو، دایکی باوکم بەخێوی کردم، گوایـە شـیری مانگای دەدامیێ، هێشتا چلـەی دایکم نەچووبوو، باوکم ژنێکی دی هێنـا... پـاش یـەک دوو مانگێکیش، نەنکم مـرد... نازانـم چ کەسـێک نـاوی (سـەرە خـۆرە)ی لێنـام، بـێ پەنـا و دەرەتـان مامـەوە، چ کەسـێک نەبـوو بمگرێتـە خـۆی، تەنها مالـی (خالـە حەمـەم) نەبێت، ئەویـش حـەوت منداڵـی هەبـوو، ژنەکەیشی هەمیشە نەخۆش و لاواز، خۆیشی هەندێک شێتۆکە بوو، گـەر توورەبا، گـەورە و بچووکی نەدەزانی، زمانی لـە بیـر دەچووەوە، بـە تێلا (شـەلم کوێـرم ناپارێـزم،) دەهاتـە گـۆ... کەچـی هـەر تەنهـا ئەویـش بـوو... دەیتوانی لـە ڕووی باوکمدا بوەستێت، قسـە بداتـە بـەر قسـەی، لەنێو خەڵکی ئاواییدا، سـەدبارەی بکاتـەوە و پێـی بڵێـت: - قوربـان... تـۆ زیارەتـی مالـی خـوات کـردووە، بـە نـاو (حاجییـت) هـەی تانجـی! گـەر تۆزقاڵێـک غیرەتـت هەبـا، سـەیرت دەکـرد چلـەی ژنەکـەت بچێت، ئەوجـا ژنێکی دیـت دەهێنـا... گـەر زەڕەیەکیش ڕەحمت هەبـا، لەبـەر ژن منداڵێکی سـێ - چـوار مانگـەت دەرنەدەکـردا!

باوکیشـم هـەر ئەوەنـدەی لـە دەم دەهاتـە دەر، (شـێتە و لێـی ناگیرێـت.) بـەڵام ڕاسـتییەکەی ئـەوە بـوو پێـی نەدەوێـرا.

وەک دەشـگێڕنەوە - ئۆباڵێکیش بە ئەسـتۆی ئـەوان - پـاش ئەوەی نەنکم دەمرێـت، ڕۆژێـک یـا دووان بـە برسـییەتی دەمێنمـەوە، گریانـە بێئامانەکـەم دەوروبـەر هەراسـان دەکات، گوایـە حاجـی باوکـم و باوەژنەکـەم فڕێـم دەدەنـە کەلاوەیەکـی تەنیشـتی ماڵەکەمـان - خەڵکـی ئاواییـش نازانـن چـەن سـەعات لـەو کەلاوەیـەدا ماومەتـەوە... تەنهـا ئەوەنـدە دەزانـن، بـە ڕێکـەوت

منداڵێک دەبینن، دەمی بە گوانی دێڵە سەگێکەوەیە و دەیچەکێنێت! ئیدی خەڵکی ئاوایی لێی کۆدەبنەوە، دەیبەنە مزگەوت، لە حەوزە ئاوەکەیدا گلاویی دەردەکەن! پاشانیش دەیسپێرنە دەستی (حەمە شێت) و پێی دەڵێن: (هەرچی ئەرک و مەسرەفیشی هەیە، لەسەر ماڵانی گوندەکەیە.

(حەمە شێتی خاڵۆم) لەگەڵ هەموو دەسکورتییەکی خۆیدا، قایل نابێت چ کەسێک مەسرەفم بکات، بەڵام لە ئاستی سوێندی ڕیش سپییانی ئاوایی هیچی پێناکرێت و بەناچاری قایل دەبێت، هەموو گوند - جگە لە باوکم - مەسرەف و یارمەتیم بدەن... بەم حیسابە لە هەموو منالێکی گوند زیاتر (شتومەکم) هەبوو، لە پۆشاک و پێویستییەکانی دی، نەک پەکم نەکەوتبوو، بەڵکوو زیادیشم هەبوو، بەشی منداڵەکانی خاڵۆ حەمەشی دەکرد...

پێش ئەوەی بمنێنە بەر خوێندن، ڕیش سپییەکانی دێ کۆ دەبنەوە و بڕیار لەبەر ئەوە دەدەن، کە بە ناوی چ کەسێکەوە جنسییەم بۆ دەربکەن، هەموو تێکڕا لەسەر ئەو بڕیارە لەنگەر دەگرن، کە دەبێت بە ناوی شێخ ڕەش - ەوە جنسییەم بۆ دەربکەن، ئیدی نازانم چۆن و بە چ فرت و فێڵێک لە دائیرەی نفوس بەم ناوەوە جنسییەم بۆ دەردەکەن... بە ناوی مستەفای شێخ ڕەش داخڵی قوتابخانە کراوم و تا شەشی سەرەتایی لە قوتابخانەی گوندەکەمان قوتابییەکی زیرەک بووم... کە شیرە خۆرە بووم، خاڵۆژنم نەخۆش و کەم شیر بوو، ئافرەتانی ئاوایی، بە نۆرە و هەر ڕۆژە و یەکێکیان شیری دەدامی، تا وای لێهات پاشان مەلای دێ فەتوای دا:

- (باوک بۆ کوڕ، بۆ یەکدی بگێڕنەوە، مستەفای شێخ ڕەش، مارەی چ کچێکی ئەم گوندەی لێنابێت... هەموو کچەکانی گوند خوشکی شیری

ئەم کوڕەن).

ئیدی نەک خوشکی شیری، برای شیریشم زۆر بوو، هەموو ماڵێکی گوند - جگە لە ماڵەکەی باوکم - ماڵی خۆم بوو، باوکم حەزی نەدەکرد بە هیچ جۆرێ چاوی بە من بکەوێت، دیار بوو نیگای من ئەو ڕۆژەی وەبیر هێنایەوە، کە خەڵکی ئاوایی منداڵێکی ساوایان بە دەستەوەیە، هەزاران نەفرەت لەو باوکە دەکەن وا ئەوەندە ناپیاو و بێڕەحمە!

بە پێی هەموو حیسابێکی ئینسانی دەبا ڕقم لە باوکم بێت، بە هیچ جۆرێک بە ئینسانم نەزانیبا، کەچی ڕقم لە زڕدایکەکەشم نەدەبووەوە، لەبری ئەم ڕقە، بەزەییەکی سەیرم بە باوکمدا دەهاتەوە، گەلێک جار - بەتایبەتی لە جەژناندا - حەزم دەکرد بچمە ماڵی باوکم، گەلێک هانی خۆمم دەدا، شەوان بڕیارم دەدا، بەیانیش پەشیمان دەبوومەوە، دەترسام و نەدەچوومە ماڵەکەی، نەوەک دەرم کات، بۆیە هەر لە دوورەوە چاوم دەبڕییە دەرگاکە و بەس! (نەشمدەزانی چ هەستێک وام لێدەکات بەزەییم بە باوکمدا بێتەوە، بە تایبەتی ئەو کاتانەی لەسەر کۆنکرێتی حەوشەی مزگەوتەکە و لە سێبەری دارچنارە گەورەکەدا دادەنیشت و لەنێو پیاواندا قسەی دەکرد، منیش لە دوورەوە دەوەستام و گوێم هەڵدەخست، دەمزانی هەندێک هەرزە گاڵتەی پێدەکەن، کەچی ئەو بە هیچ جۆرێ هەستی بەوە نەدەکرد، کە پێی ڕادەبوێرن.

سەدان جار گوێم لێ بووە، پێیان دەگوت:

- ئێ، حاجی، چۆن چوویت بۆ حەج؟ خۆش بوو یان نا؟

باوکیشم وەک قەوان سەدبارەی دەکردەوە:

- بە قوڕم گرت... ئای کە چەند دوورە، چ سەحراییێکە، یا خوا ئەوەی موسوڵمانە ڕێی نەکەوێتە ئەوێ!... خۆ هەموو هەر وە عارەوی نوێژ

دەکەن.

باوکم پێی وابوو، ئەو نوێژەی دەیخوێنێت، کوردییە... کوردییەکە، ئەوەی ئیمانی بە خوا و قیامەت نەبێت لێی ناگات... نییەتی بە کوردی دەهێنا، وای دەزانی ئایەتەکانیش جۆرێکن لە کوردی، ئیتر بە ئارەزووی خۆی سەر و پۆتەلاکی ئایەتەکانی دەشکاند.

هەرزەکانیش سەری باسێکی گۆلمەزئامێزیان وەدەست دەهێنا، بە پرسیاری سەیر سەیر گەمارۆیان دەدا.

- باشە حاجی، لە حەجدا دوعایێکت بۆ ئێمە کرد؟

- ئەی چۆن... زۆر دوعای خێرم بۆ کردن.

- وەکوو چی؟

- گوتم: خوایە، کوردان، لە شەڕی شەیتان و بەلای ناگەهان بپارێزێت!

- هەر کوردان؟ ئەی ئەوانی دی؟

- ئەوانی دی کێن؟

- عارەب، تورک، فارس.

- گەلێک عارەب و توورک و فارس... نازانم چی تری لێبوو... ئەوان دوعایان بۆ ئێمە نەدەکرد.

- چوزانی؟

- ئەی ئێوە چوزانن؟ حەی، ئێژی لەوێ بوون و لەنێو دلە... سا

وەسی جزمەی قوڕعان، لەوێشا... کفر بە پیاو دەکەن...

- دەی بیڵێ حاجی... دەزانین دەیڵێیت...

- بێژم چە هەی... خۆ ئەم دنیایەیان لێکردووین وە جەهەنم.

- باشە حاجی وتمان (ئەوان) ئەم دنیایەیان لێکردووین بە جەهەنەم، ئەی ئەو دنیا...؟

- هەی قوڕ وەسەرتان... بۆ خۆتان و عەقڵتان، لەو دنیا خوا و پێغەمبەر و چوار خولەفا و ئەسحابەکانیش عارەون... نەگبەتینە، ئێوە چیتان پێدەکرێت، هەر بێکەس کوژتان دەکەن و کەسێکتان ناتوانێت فزە بکات... هێشتا ئەم دنیایە خۆشترە... هەر هیچ نەبێت دەتوانن وە کوردی قسان بکەن.

- چاکە حاجی، تۆ سەرت بچێ نوێژت ناچێ، یانی چی ئەم قسانە دەکەیت؟ کفرە... کفر!

- قسەی قۆڕ... کفر... کفری چی... خوا خۆی لە قورحانا فەرموویەتی قسەی حەق بکەن... حەق... حەق... دەزانن حەق یانی چی... یانی حەق تێکەیشتن؟

ئەگەر درێژەیان بەم باسە دابا، ئەوا بێ شک یەکە دوو کەسی ئیهانە دەکرد، بەناچاری باسەکەیان دەگۆڕی، دەهاتنە سەر ئەو باسەی کە باوکم زۆر پێی خۆش بوو لە ڕۆژێکدا دەیان جار بیگێڕێتەوە!

- باشە حاجی... ئەو خوا نەناسانە، کە فەرهوودیان کردین. تۆ... نەیدەهێشت قسەکە تەواو بکەن، زوو لە دەمیانی وەردەگرت و دەیگوت:

- (ئەوانـەی) هـەر کـەس ناناسـن... نـە خـوا... نـە پێغەمبـەر... سـاڵی (حـەرەس قەومییەکـە) هـەر لـەم گونـدە حازرییـەی خۆمـان، دەرلنگی دەرپێی ژنانیـان دەبەسـت و توتنیـان تێدەکرد و دەیانـدا بەکۆڵدا، هـی وایـان هەبوو، ئەوەنـدە مریشـک و قـەل و قـاز و مـراوی هەڵگرتبـوو، لەنێـو ئـەو تەیـر و تیـورەدا نەدەبینـدرا... مـەڕ و ماڵاتیـان دەدایـە بـەر... کورتانیشـیان دەدڕی... کورتـان!

قسەکەیان لە دەم دەقۆزتەوە و لەپڕ پێیان دەگوت:

- ئەی حاجی... تۆ چیت کرد؟

باوکیشم کلیلی زمانی دەکرایەوە.

- ماینەکوێتـم زیـن کـرد، پێش ئـەوەی (ئـەوان) بگەنـە نێـو دێ، تفەنگـە پێنـج تیـرە ئینگرێزیەکـەم نایـە شـان، بـە چەمـا بـەرەو خـوار بوومـەوە، لـە پاینی گوێزەکانی ئەولقادر ئەفەنی و لـە کەندێکدا ماینەکوێتم بەستەوە، بـە دزەدز خۆم گەیانـدە (شـێخ ڕەش) و ڕێـی گەڕانـەوەم لـێ گرتـن، بەئەسـپایی چوومـە سـەر پیـرە داربـەڕوو، متەقم لەخـۆم بـڕی، نیـو سـەعاتێک چاوەڕێـم کـرد، بـە خۆیـان و مـەڕ و مـاڵات و شـتومەکی فەرهـوودەوە گەڕانـەوە، گوێـم لێبـوو دەیانگوت:

- ( ئیحنا بەدو، وێن ئەلعەدو).

یەکسەر ئەم قسەیەیان پێ دەبڕی:

- حاجی، ئەمەیان مەعنای چییە؟

- من لەم عارەوییە تێناگەم... نازانم، کتێوی نییە.

- باشە، با لەمەیان گەڕێین... چیت کرد؟

- چیم کرد؟ هەی لەو عەقڵەتان... چۆن دەمهێشت دەرباز بن... ناوی خوا و پێغەمبەرم هێنا، هەر کە یەکەم تەقەم کرد، زلەیەکیان وەک گا بۆڕەیەکی لێوە هات و بە پشتا کەوت، ئیتر هەر (یابە) بوو دەیقیژاند، ئەو ناوە لەبەر قەل و مریشک و قاز و وڵاخی بەرزە و مەڕ و بزن، جمەی دەهات، فرکان فرکانێک بوو، دەتگوت ڕۆژی حەشرە، قرەقڕ و بارەباڕ و تەپوتۆز سەری لێ شێواندبوون، نەیاندەزانی لە کوێوە تەقەیان لێ دەکرێت، منیش جاری یەکەم لەسەر یەک چوار فیشەکم تێگرتن (ئەوان) وایان دەزانی چەن کەسێک تەقەیان لێدەکەن، بۆیە کوێرانە بە دەوروبەری خۆیاندا تەقەیان دەکرد... بە خوا ڕۆژێکی خۆش بوو، تا خوا پێی خۆش بوو تەقەم لێکردن و لێیانم کوشت... ئەوەندە شپرزە بوون، مەگەر هەر ئەو خوایە بزانێت چۆن ئەو سێ - چوار مەیت و بریندارەی خۆیان گواستەوە... بە قیژە بەرەو خوار بوونەوە، منیش لەسەر دارەکە کەوکوژی سێرەم لێدەگرتن، لنگەوقوچیانم دەکردەوە... ئای کە لنگەفرتێکەیان خۆش بوو... دەیانلووراند... بەرەو خوار، بۆ ئەو شوێنەی - عەیبە و پیاو نابێت بیڵێت - ئیتر ون بوون.

- حاجی زۆرت لێ کوشتن؟

- تا خوا پێی خۆش بوو.

- جا خوا ئەمەی پێ خۆشە؟

- ئەی چۆن... لە حەدیسا، نەتانبیستووە (ئەرزوکوم، دینوکم)!

- ئەمە یانی چە؟

- حەی... یانی ئەرزەکەتان، ئەو ئەرزەی لەسەریا دەژین، ئەوە وەکوو دینی ئێوە، ئەگەر داگیر کرا، وەک ئەوە وایە دینەکەتان لێ داگیر بکرێت...

- حاجی ئەمەمان نەبیستووە...

- من ئێژم ئێوە منداڵن... ئەی باشە نەتانبیستووە (من یقتل في سبیل الله جنات الانهار).

- قوربان ئەمەیان ئایەتە؟

- بەڵێ، کەلامی بینایی چاوانە، لە قورحانی کەریم و لە سوورەی ئەلئەلعامدا فەرموویەتی.

- یانی مەبەستت سورەتی ئەلئەنعامە؟

- بەڵێ، فەرقی نییە... یەک حیساوە.

- قوربان ئەگەر ئایەتیش بێت، بە ناتەواوی خوێندتەوە، دەبێ بڵێیت (جنات تجری من تحتها الانهار).

باوکم بەتووڕەییەوە وەڵامی دەدایەوە و هەڵدەچوو...

- وانییە... من ئێژم وانییە... ئەمە تازە وای لێهاتووە! لە سەردەمی ئێمەدا وا نەبوو... دەردی وڵاتانە چینگسرۆفاکیا و یونغسلافیا... نازانم تەڕەماش و تەڕەساس. کەی لە سەردەی ئێمەدا ئەم وڵاتانە هەبوون... ئەمانە تازەن... هەر ئێران و تۆران و عێراق و تورک و عروس هەبوو، خوا قبووڵ ناکات جارجارەش ناوی ئینگلێس هەبوو.

- حاجی لەمانە گەڕێین... ئەرێ لەو شەڕەدا هیچت دەستکەوت؟

- ئەی چۆن... بێ قەزابن... خوا دەیزانێت ئەوە دوانزە ساڵە چ گوریسێکم نەکڕیوە... قایمن، قایم!

بۆ ئەوەی هەندێک باوکم قەڵس بکەن، یەکێکیان لەپڕ قسەکەی پێ دەبڕی.

- ئاخر حاجی - بێ قەزا بێت - خەتای تۆ بوو وا گوندەکەمانیان سووتاند.

- کوڕە بڕۆ هەی دەمڕووت... ڕاست ناکەیت(ئەوان) هەر دەیانسووتاند، خۆ چ کەسێک لە دێیەکانی دەوروبەر تەقەیان نەکردبوو، وا داریان بەسەر بەردەوە نەهێشت... خۆزیا لەو دێهاتانەدا هەندێک تەقەیان دەکرد، جا با بوێرابان ئاوها بە ئاسانی فەرهوودمان بکەن...

وەک دەگێڕنەوە:

(بەرەبەیانی پاش ئەو ڕۆژەی حاجی تەقەی لێ کردن، هەموو گوند بەدەنگی تانک و مودەرەعە وەئاگا هاتن، هەر لە دورەوە بە تۆپی دەبابە بەرەو ئاوایی دەهاتن، ئەوەی ئازا بوو، بەرەو چیا - بۆ لای حاجی، کە هەر لە شەوەوە چووبووە چیا - کەوتنە ڕێ و خۆیان دەرباز کرد، گەلێک پیرەمێرد و منداڵ و پیرێژن، دواکەوتن، ئەو چەند کەسەی مابوونەوە - مەلای دێ یەکێکیان بوو - لە پەنایەکدا خۆیان مات دابوو، کە (ئەوان) گەیشتنە نێو دێ، هەندێک لە خانووبەرەکان بەرکەوتبوون و داتەپیبوون... مەلا لە پەنا دێتە دەر، بە قورئانێکەوە دەخالەتیان دەکەوێت، ناهێڵن هیچ قسەیێک بکات، دەستڕێژی لێدەکەن، مەلا و قورئان دەکەونە بەر پێیان، بە پۆستاڵ دەچنە سەریان، بێ سێ و دوویش دەستڕێژ لەو خەڵکە دەکەن... ئیدی مزگەوت و قوتابخانە و ماڵان دەسووتێنن، دێ

لەگەڵ زەویدا یەكسان دەكەن... ئەو خەڵكەی گەیشتبوونە چیا، چاویان لەو بەزم و ڕەزمە بوو، دێیەكانی دەوروبەریشیان دەبینی، كە چۆن لەنێو چڕە دووكەڵی ڕەشدا نوقوم بوون).

وەك دەگێڕنەوە:

(هەر شەوی پاش تەقەكانی حاجی محێدین... حاجی بە خۆی و تفەنگەكەیەوە، لەنێو دێدا وەستابوو، بە خەڵكەكەی دەگوت و ڕجای لێدەكردن: مەردی خوا بن، هەر ئەم شەو ئەم دێیە جێ بێڵن، ئەو چیایە پشتمانە و پەنای بۆ ببەن) كەچی هەندێك كەس لەو خەڵكانەی كە پاشان و بۆ ڕۆژی دوایی كوژران، بە حاجییان دەگوت: خۆ ئێمە لێیانمان نەكوشتووە، كێ ئەوەی كردووە، با ئەو بچێتە چیا، حاجیش بەتەوسەوە پێی دەگوتن: بەڵێ، حاكم و قازی دێنن، مەحكەمە دادەمەزرێنین و داوای شاهیدیش دەكەن... بەڵێ... چاوەڕێ بكەن!

وەك دەگێڕنەوە: بۆ ڕۆژی دوایی بە مەلای گوندەوە هەژدە پیاو كوژرا، چوار منداڵ و سێ ئافرەتیش كەوتنە ژێر خانووەوە، دوانزە كەسی دیش بریندار بوون!

ئیدی هەموو جارێكیش بەم پرسیارە كۆتاییان بەم قسە و باسە دەهێنا:

- ئەرێ حاجی، بۆ وایان لێ دەكردین؟

- باشە چەند جارم پێگوتن، چونكە كوردین، كورد!

هەر كە باوكم چاوی بە من دەكەوت - لە دورەوە وەستاوم و گوێم بۆ قسەكانی هەڵخستووە - بەتووڕەییەوە سەرنجی دەدام و هەڵدەستایە

سەر پێ، منیش دەترسام، وام دەزانی بۆ من دێت، ڕامدەکرد و ئەو ناوەم جێ دەهێشت.

***

کە مێردمندال بووم و ئەم قسانەی باوکمم دەژنەوت، وام دەزانی کوڕی کابرایەکی زۆر شارەزا و ئازام، بەلام کە زەردەخەنە تەوسئامێزەکانی هەرزەی بە ڕووی قسەکانی باوکمدا دەتەقینەوە، ئیدی منیش دەکەوتمە گومانەوە، گومانێکی سەیر و بێدەنگ، خەجالەتی دایدەگرتم، گەر ئەو گومانەم وەبیر هاتبا... گومانێک بوو شەو و ڕۆژ پێوەی دەتلامەوە، حەزم نەدەکرد بە چ جۆرێک چیدی گوێبیستی ئەم قسانەی باوکم ببم... ئەو قسەی دەکرد، من ئارەق بە نێوچاوانمدا دەهاتە خوارێ... چ کوڕێک دەتوانێت، تەنانەت بە باوکێکی بێڕەحمی خۆی بڵێت (فشەکەرە و حەیای بردووین) گەلێکجار، هەر پاش قسەکانی، یەکسەر بەرەو (شێخ ڕەش) ڕامدەکرد ئەو ناوەم دەپشکنی، گەلێ جاریش دەوروبەری دارەکەم هەڵدەکەند، کەچی بەکەساسی و بە دەستی خاڵییەوە دەگەڕامەوە، تا جارێکیان لە پایینی (شێخ ڕەش)دا قەوانە فیشەکێکی ژەنگاویم دۆزییەوە، ئای کە کەیفخۆش بووم، خەریکبوو لە خۆشیا پەڕوپۆ دەربکەم و بفڕم، هەر ئەو ڕۆژە پیشانی هاوڕێکانم دا، لەسەریەک دەمگوت:

- ئا... ئەمەتا... ئەمە یەکێکە لەو قەوانە فیشەکانەی باوکم لە ساڵی (حەرەس قەومیەکە)دا لە(شێخ ڕەش) تەقاندوونی:

چ جارێک ئەوەندەی ئەوجارە بە خۆمدا نەهاتوومەتەوە و تەریق نەبوومەتەوە، کە یەکێک لە هاوڕێکانم - کە لە خۆم گەورەتر و شارەزاتر بوو - بە پێکەنینێکی ژەهراوییەوە گوتی:

لەگەڵ زەویدا یەکسان دەکەن... ئەو خەڵکەی گەیشتبوونە چیا، چاویان لەو بەزم و ڕەزمە بوو، دێیەکانی دەوروبەریشیان دەبینی، کە چۆن لەنێو چڕە دووکەڵی ڕەشدا نوقوم بوون).

وەک دەگێڕنەوە:

(هەر شەوی پاش تەقەکانی حاجی محێدین... حاجی بە خۆی و تفەنگەکەیەوە، لەنێو دێدا وەستابوو، بە خەڵکەکەی دەگوت و ڕجای لێدەکردن: مەردی خوا بن، هەر ئەم شەو ئەم دێیە جێ بێڵن، ئەو چیایە پشتمانە و پەنای بۆ ببەن) کەچی هەندێک کەس لەو خەڵکانەی کە پاشان و بۆ ڕۆژی دوایی کوژران، بە حاجییان دەگوت: خۆ ئێمە لێیانمان نەکوشتووە، کێ ئەوەی کردووە، با ئەو بچێتە چیا، حاجیش بەتەوسەوە پێی دەگوتن: بەڵێ، حاکم و قازی دێنن، مەحکەمە دادەمەزرێنین و داوای شاهیدیش دەکەن... بەڵێ... چاوەڕێ بکەن!

وەک دەگێڕنەوە: بۆ ڕۆژی دوایی بە مەلای گوندەوە هەژدە پیاو کوژرا، چوار منداڵ و سێ ئافرەتیش کەوتنە ژێر خانووەوە، دوانزە کەسی دیش بریندار بوون!

ئیدی هەموو جارێکیش بەم پرسیارە کۆتاییان بەم قسە و باسە دەهێنا:

- ئەرێ حاجی، بۆ وایان لێ دەکردین؟

- باشە چەند جارم پێگوتن، چونکە کوردین، کورد!

هەر کە باوکم چاوی بە من دەکەوت - لە دورەوە وەستاوم و گوێم بۆ قسەکانی هەڵخستووە - بەتووڕەییەوە سەرنجی دەدام و هەڵدەستایە

سەر پێ، منیش دەترسام، وام دەزانی بۆ من دێت، ڕامدەکرد و ئەو ناوەم جێ دەهێشت.

***

کە مێردمنداڵ بووم و ئەم قسانەی باوکمم دەژنەوت، وام دەزانی کوڕی کابرایەکی زۆر شارەزا و ئازام، بەڵام کە زەردەخەنە تەوسئامێزەکانی هەرزەی بە ڕووی قسەکانی باوکمدا دەتەقینەوە، ئیدی منیش دەکەوتمە گومانەوە، گومانێکی سەیر و بێدەنگ، خەجاڵەتی دایدەگرتم، گەر ئەو گومانەم وەبیر هاتبا... گومانێک بوو شەو و ڕۆژ پێوەی دەتلامەوە، حەزم نەدەکرد بە ج جۆرێک چیدی گوێبیستی ئەم قسانەی باوکم ببم... ئەو قسەی دەکرد، من ئارەق بە نێوچاوانمدا دەهاتە خوارێ... چ کوڕێک دەتوانێت، تەنانەت بە باوکێکی بێڕەحمی خۆی بڵێت (فشەکەرە و حەیای بردووین) گەلێکجار، هەر پاش قسەکانی، یەکسەر بەرەو (شێخ ڕەش) ڕامدەکرد ئەو ناوەم دەپشکنی، گەلێ جاریش دەوروبەری دارەکەم هەڵدەکەند، کەچی بەکەساسی و بە دەستی خاڵییەوە دەگەڕامەوە، تا جارێکیان لە پایینی (شێخ ڕەش)دا قەوانە فیشەکێکی ژەنگاویم دۆزییەوە، ئای کە کەیفخۆش بووم، خەریکبوو لە خۆشیا پەڕوپۆ دەربکەم و بفڕم، هەر ئەو ڕۆژە پیشانی هاوڕێکانم دا، لەسەریەک دەمگوت:

- ئا... ئەمەتا... ئەمە یەکێکە لەو قەوانە فیشەکانەی باوکم لە ساڵی (حەرەس قەومیەکە)دا لە(شێخ ڕەش) تەقاندوونی:

چ جارێک ئەوەندەی ئەوجارە بە خۆمدا نەهاتوومەتەوە و تەریق نەبوومەتەوە، کە یەکێک لە هاوڕێکانم - کە لە خۆم گەورەتر و شارەزاتر بوو - بە پێکەنینێکی ژەهراوییەوە گوتی:

- ئەمە قەوانە فیشەکی بڕنەوە!

ئیدی چ شتێکم نەبوو، یا ڕاستتر باوکم چ شتێکی لە دەروونمدا نەهێشتبوو، کە ببێتە مایەی ئەوەی منیش وەکوو زۆربەی منداڵان شانازی بە باوکی خۆمەوە بکەم - ئەگەرچی هەموو دێ، جگە لە خۆم، پێیان ناخۆش بوو گەر - بەو کابرایەم - گوتبا باوە...

ئیدی لەوەولا، حەزم نەدەکرد لە دووریشەوە باوکم ببینم، دەیان جار لە پیاوانی ئاواییم بیستبوو:

(حەیفێ... حاجی وا بێڕەحمە! دەنا پیاوێکی گەلێک ڕەشیدە... ساڵی (حەرەس قەومی)یەکە یەکەم پیاوی ئەم ناوە بوو، کە ئەم گوندەیان سووتاند، جا چی نەیهێشت ساڵ بگەڕێتەوە، قۆڵی هیمەتی لێ هەڵماڵی، بناغەی گوندی دارشت، هانی خەڵکی دەدا، تا ئاوها ئاوەدانیان کردەوە).

وەک باس دەکەن:

(حاجی، بەر لەوەیماڵەکەی خۆی ئاوەدان بکاتەوە، هەر لە بەیانی تا ئێوارێ ئەوەندەی یەک دوو کرێکاری کۆککاری بۆ ئاوەدانکردنەوەی قوتابخانە و مزگەوتەکە دەکرد... پاشان ماڵی ئەو کەسانەی کە مێرد و کوڕ و کەسوکاریان کوژراون، دوا شت ماڵەکەی خۆی بوو... بە دەنگی بەرز هانی خەڵکەکەی دەدا، ورەی بەرز دەکردنەوە و پێی دەگوتن:

- چاکتر ئاوەدانی بکەنەوە، قوتابخانە و مزگەوتەکەش گەورەتر بکەن... با بەشێوەیەکی چاکتر خانووبەرەکان دروست بکەینەوە... دەی کوڕینە، با هەر ماڵێک لەنێو حەوشەکەیدا سەنگەر و کونە تەیارەیەکیش لێبدات.

وەک دەگێڕنەوە، ئەو ساڵە تەمەنی مەحمودی برا بچووکم سێ ساڵان بوو.

***

گەورە و بچووکی دێم خۆش دەویست، ئاشنای هەموو شتێکیان بووم، تەنانەت باڵندە و ئاژەڵەکانیش ئاشنام بوون - تەنها باوکم نەبێت - کە ڕۆژ بە ڕۆژ ڕق و بەزەییێکی سەیر لە ناخیدا دژ بە یەک دەجەنگان، هەر کە دەمبینی باوکم ئەوەندە بێبەزەییە و زەڕەیێک ڕەحمی ئینسانی لە دڵدا نییە، حەزم دەکرد منیش وەک زۆربەی خەڵکی دێ نەفرەتی لێ بکەم... بەلام کە لە پیرەمێردەکانم دەبیست:

- حاجی بەجەرگ و ڕەشیدە... پیاوی ڕۆژی تەنگانەیە... گەلێک کوێرەوەری بینیوە.

دڵم پێی دەسووتا، هەموو ئاوایی سەرگوزشتەکەی باوکمیان دەزانی، خۆی - هەرگیز - باسی نەدەکرد، دەنا گەورە و بچووک بەسەرهاتەکەیان دەزانی...

وەک باس دەکەن:

- سی - چل ساڵێک لەوەوبەر، باوکم لەسەر کەرێک گۆبەنێکی ناوەتەوە - لە هەڕەتی لاویدا گەلێک گومڕا و سەرەڕۆ دەبێت، کەرێک دەچێتە نێو توتنەکەیان، ئەویش - دیارە چەن جارێک بە خاوەنەکەی گوتووە بەڕەلای نەکات و زەرەر نەدات، دووریش نییە خاوەن کەر، هەر گوێی نەدابێتێ - باوکم تووڕە دەبێت، کلک و گوێی کەرەکە دەبڕێت، خاوەن کەر بەمە دەزانێت، برایەکی باوکم دەکوژێت، باوکیشم دەسبەجێ خاوەن کەر سەردەبڕێت، ئیدی دووژمنایەتییێکی گەرم دەکەوێتە نێوانیان،

کەسوکاری خاوەن کەر دەستیان ناگاتە باوکم، لە فرسەتێکدا باپیرم دەکوژن... ئیتر خەڵک و خوا دەکەونە نێوانیانەوە، سوڵحیان پێدەکەن و لە بری خوێن دایکم دەدەنە باوکم... بەلام باوکم وەک خۆی لەنێو خەڵکیدا باسی کردبوو، بە دڵ سوڵحی نەکردبوو، نەفرەتی لەو بنەماڵەیە دەکرد، هەموو شتێکیانی بە دوژمنی خۆی دەزانی.

دەشێت باوکم هەر لە ڕوانگەی دوژمنایەتییەوە ڕوانیبێتیە من و بە نیوە دوژمن لە قەڵەمی دابم... بەر لەم کارەساتەش، کارەساتێکی جەرگبڕتری تووش ببوو، ئەویش حەز لە کچە گەرمیانییێک دەکات، چەن جارێک دەنێرێتە خوازبێنیی، کەچی نایدەنێ و پێی دەڵێن، ئێمە بە کچی دەدەین و ژن بە ژنی پێدەکەین، باوکم خوشکی نابێت و کچە فریو دەدات و هەڵیدەگرێت... هەر ئەو ڕۆژە شوێنیان دەکەون، فرسەتیان لێدێنن و کچە دەکوژن، باوکیشم بریندار دەکەن، بە سەد دەرد و مەینەتی خۆی دەرباز دەکات... جارێکی دیش لەنێو دێدا، کەسوکاری کچە فرسەتی لێدێنن، فیشەکێک دەنگاونە سەر سینگی، نیوەمردووی دەکەن، کەس نەیدەگوت دەمێنێت، کەچی وەک پشیلەی حەوت ڕۆح، پاش یەک - دوو مانگێ، بە هەمان خۆگێفکردنەوەوە دەکەوێتەوە گەڕ.

***

لە دێدا کەم کەس باوکمیان خۆش دەویست، ئەویش نەک سەبارەت بەوەی، قسە ڕەق و بێڕەحم بوو، بەڵکوو بەشی زۆری ڕقەکەیان لەبەر ئەوە بوو، کە (مەسئولی) دێ بوو، زیاتر لە هەموو کەسێک شارەزای یەک بە یەکی خەڵکی ئاواییەکە بوو، دەیزانی چ کەسێکیان ئیش بە نیوە چڵ جێ دێڵێت و چ کەسێکیشیان بە دڵ و بە گیان دڵسۆزە، لەگەڵ پێشمەرگە و کادردا بە سەر و ماڵ لە خزمەتدایە... وەی بۆ ئەو کەسانەی

بە ئیشوکاری پێشمەرگە و پێویستییەکانیان قەڵس دەبوون، نەک تەنها سەرزەنشتی دەکردن، بەڵکوو کارەکەی بۆ قورستر دەکردن و دەینەڕاندە سەریان:

- (ئا... خۆتان لەنێو پێخەفی گەرم و لە باخەڵی ژنەکانتان تا بەیانی... ئەم پێشمەرگە زەرد و سوورانەش لەنێو بەفر و لەبەر باران لە چیادان، زەوی ڕایەخیانە و بەردی (نەرمیش) سەرینیان!... بۆ کێی دەکەن؟ بۆ ئێمە نییە؟ بۆ قسە ناکەن؟ کەچی کە سووکە ئیشێکیان بە ئێمە دەکەوێت، لە باتی ئەوەی بە دڵ و بە گیان ئیشەکەیان ڕاپەڕێنن، یەکێک دەڵێت، هێسترەکەم لە ماڵ نییە، یەکێکی تر دەڵێت، ئاردم نییە، شەکرم نییە... خوای دەکرد لە برسا دەمردن و چاوتان دەردەهات، ئەوەی پێی خۆشە سەربەرز بێت، دەبێت هەموو کارێکی پێشمەرگەکان مەیسەر بکات... دەنا، بۆ کوێ دەڕوات حەوت بەردی لە دوو، نازانم تا کەی تێناگەن، تا کەی فکر ناکەنەوە و بزانن گەر پێشمەرگە نەبێت، ئەوەی بە کوردی قسان بکات، زمانی دەبڕن، هەر هەموو کوردان دەبەنە سەحرا و جەزیرە و جەهەنەم! کەی تێدەگەن، ئەم کوڕە نازدارانە بۆ سەربەرزی ئێوە خۆ بە کوشت دەدەن... خۆ هەندێکتان تیادایە وا دەزانێت دنیا هەر ئەم گوندەی ئێمەیە و بەس! ئیتر هەموو خەمێکی لە باغ و ماڵ و توتن و ڕەز و ژن و منداڵەکانی تێناپەڕێت... خۆزیا دەسەڵاتم دەبوو، ئەوسا هەر خۆم دەمزانی چۆن سێدارەیەکم بۆ هەڵدەخست).

کەس نەیدەوێرا فزە بکات و بڵێت ئیشی پێشمەرگە ناکەم... بەقەد ئەوەی باوکم لەلای بەشێکی زۆری خەڵکی ئاوایی بێزراو بوو، دووئەوەندە لەلای پێشمەرگە و کادر خۆشەویست بوو، هەچ کارێکی قورسیان هەبا، بەسووک و ئاسانی وە ئەنجامی دەگەیاند، دەیان جار دەبووە دەلیلیان و دەیانبردە سەر مۆڵگەی جاشان و ڕەبایای عەسکەر و جاش، ڕێنمایی

دەکـردن، لـە چەندیـن شــەڕدا بەشــداری کردبـوو، بـە دیـاری تفەنگێکـی برنـەوی ڕەقـەم حەڤدەیـان دابـووێ، ئیـدی باوکـم هەنـدەی دی خـۆی گـڤ دەکـردەوە و خـۆی بـە ئیمپراتـۆری دێ دەزانـی، ناحەقـی نەبـوو، کێشــە و ناکۆکییەکانـی نێـو دێ لەلایـەن دادگای پێشـمەرگەوە ڕووبـەڕووی باوکـم دەکرانـەوە، ئەویـش بـە تۆپـزی سـوڵحی عەشـایەری ئەوتـۆی پـێ دەکـردن، چ عەقڵێک قەبووڵـی نەدەکـرد، بـەڵام دەیسـەپاندە سـەریان، دەبـا ملکەچیش بـان، دەنـا لـە حیسـاباتی باوکـم دەبوونـە خایەنـی کـورد و کوردسـتان!!

جارێکیـان وسـووی فاتـە بێـوەژن دەنێرێتـە داخـوازی کچەکـەی مـام نـادر، نایداتـێ، وسـووی فاتـە بێـوەژن و خونچـەی کچـی مـام نـادر دڵیـان بـە یەکدییـەوە بـوو، بـەڵام وسـووی بەسـتەزمان هــەر هیچـی نەبـوو، مـام نادریش چاوچنۆک و پارەپەرست... وسـوو ناچـار دەبێت پەنـا بەرێتـە بـەر باوکـم، ئەویـش تەکبیـری بـۆ دەکات:

- کـوڕم، چـاری ئـەم دەردەی تـۆ هەر بـە پێشـمەرگەکان دەکرێـت، بەقسـەی مامـی خـۆت بکـە، ببـەوە پێشـمەرگە، فێری زۆر شت دەبی، دەبیتـە پیاوێکـی ماقـووڵ و ئەوسـاش مامـی خـۆت قسـەیێکی خێـرت بـۆ دەکات...

وسـوو بـه قسـەی باوکـم دەکات، پـاش یـەک - دوو مانگێـک، باوکـم بـە تۆپزی خونچـە لـە وسـوو مـارە دەکات، مـەلای دێش بـەم کارە قایل دەبێت و فتـوای بـۆ دەدات، پاشـانیش بـە شـێوەیەکی سـەیر سـوڵحیان پێدەکات، بـە مـام نـادر دەڵێت:

- پیـاوی چـاک بـە... تۆیش فاتـەی دایکی وسـوو بخوازە، ئەوە چەند سـاڵە بێ ژنی... دەبێت هـەرواش بکەیت، ئەمـە قانونـی کوردسـتانە، دەبێت هەموو کەسـێک حەقی خۆی وەربگرێت، هـەر کچێک بە ئارەزووی خۆی نەدرێت بـە شـوو، هـەر باوکێک بـە زۆر کـچ بـدات بـە شـوو، ئـەوا دژی قانونـی کوردسـتانە، هـەر کەسـێکیش دژی قانونـی کوردسـتان بێت، ئەوا لـە هـەردوو دنیـادا جێی جەهەنـەم و بئس المصیـر - ە.

ئیـدی هەر حیکایەتـی دەسـکردی خـۆی بـوو، لـە دەمییـەوە دادەبـاری، باسـی ژنهێنانـی فلانـە ئەسـحابە و فلانـە پیاوچاکـی دەکـرد، هەر ئایـەت و حەدیسـی هەڵبەسـتراوی خـۆی بـوو لـە گیرفانییـەوە دەردەهات، بـە سـەر و گوێلاک شـکاوی و بـە عەرەبییەکـی (فریشـقە) دەیخوێندنـەوە... مـەلای دێش نەیدەوێرا بڵێ (شـتی وا نییـە) چونکە باوکـم دەسـتبەجێ تـوڕە دەبوو، ئیدی بـە هەزار پەڵپ و بیانـوو لێـی دەهاتـە دەسـت، گەلـێ جاریش ڕاستەوڕاست پێـی دەگـوت:

- جەنابی مامۆستا، ئەوە کام ئایەتە باسی ئەو مارەبڕینە دەکات، کە لە دە دینار کەمتر بێت، ئەوا مارەبڕینەکە بەتاڵ دەبێت، ئەری جەنابی مامۆستا، ئەوە کام حەدیسە باسی ئەوە دەکات سەرفترە و زەکات بۆ مەلا بێت؟ ئەرێ جەنابی مەلا، نوێژ بۆ خوا بەکرێ دەکرێت؟ ها، قسە بکە! - خوا قەبوڵ ناکات مەلای دێیەکەمان گەر لەکاتی خۆی سەرفترە و زەکات و یارمەتییەکی باشیان نەدابا، نە بەرنوێژی دەکرد و نە دەهاتیشە مزگەوت - مەلایش دەچووە قاوغی خۆیەوە و فزەی نەدەکرد، دەیزانی گەر بە ئاستەم وەڵامی باوکم باتەوە، ئەوا ئیدی ژیاننامەی لەسەر زاری باوکمدا، دەبووە بنێشتەخۆشە.

***

لەو نهێنییە نەدەگەیشتم، بۆچی زۆربەی پیاوانی ئاوایی حەزیان لێ نەدەکرد، کەچی هەر هەموو پێشمەرگەکان و مامۆستا بەکری مەکتەبەکەمان باوکمیان خۆش دەویست، مامۆستا بەکر نەک هەر لە مەکتەب، بەڵکوو لەنێو پیاوانی دێدا هەمیشە دووبارەی دەکردەوە و دەیگوت:

- پیرۆزترین شتێک گەر کورد شانازی پێوە بکات، ئەوە پێشمەرگەیە... هەر پێشمەرگە پارێزەری شەرەف و ناموسی کوردە... ئومێد و ئاواتی سەراپای نەتەوەیێکی دابەشکرا و زوڵم لێکراوی ئەم دنیایەیە...

ئەگەرچی ئەو سەردەمە بەجوانی لە وشەی (شانازی) و (ئاوات) و (دابەشکراو) نەدەگەیشتم، بەڵام دەمزانی ستایشە... من و هەموو قوتابیەکان، مامۆستا بەکرمان خۆش دەویست... جارێکیان لێی پرسین:

- حەز دەکەن لە دواڕۆژدا ببن بە چی؟

هەر هەموو قوتابیەکان بە یەک دەنگ گوتمان:

- پێشمەرگە.

زۆری پێخۆشبوو، بەوپەڕی ئاسانییەوە تێی گەیاندین:

- ئێوە ئێستا پێشمەرگەن! بەلام دەبێت وەک هەر پێشمەرگەیێکی ئازا و زیرەک خۆتان هیلاک بکەن... بەجوانی دەرسەکانیان ڕەوان بکەن، تا هەر یەکە ببێتە پێشمەرگەی دکتۆر، پێشمەرگەی موهەندیس، پێشمەرگەی مامۆستا...

هەر هەموومان، خۆمان بە پێشمەرگە دەزانی، بە تایبەتی ڕۆژانی نمایش، مامۆستا بەکر ڕایدەگرتین، زۆر بەنەرمییەوە دەوری دابەش دەکردە سەرمان، بە زمانێکی سادە و بێ گرێ، فێری دەکردین بۆ کورد بژین و بۆ کورد بمرین، پاش نمایشەکە، مامۆستا بەکر پێی دەگوتین:

- ئەو کوردەی بۆ سەربەرزی کورد بژی، ئەوا بۆ مرۆڤایەتی ژیاوە، خزمەتی بە هەموو ئینسان کردووە، بەلام ئەو کوردەی بۆ کوردی زوڵم لێکراو و کوردستانی دابەشکراو نەژی، ئەوا ئەو کەسە لە ژێر پەردەی هەر ناوێکدا بێت، دۆستی ئینسان و خاک و نەتەوە نییە...

گەر باوکم بە ڕێکەوت گوێی لەم قسانەی مامۆستا بەکر با، کە لە ساحەی مەکتەبەکەدا بە دەنگی بەرز بۆ قوتابیەکانی باس دەکرد، باوکم گەلێکی پێخۆش دەبوو، چەن جارێکیش لەسەر یەک دەیگوت:

- دەک ئافەرین... سەد ڕەحمەت لەو کەسەی شیری داوی!

ئیدی باوکم هەمان قسەی مامۆستا بەکری بەناوی یەکێک لە ئەسحابەکانەوە، بۆ پیاوانی ئاوایی دەگێڕایەوە، چ کەسێکیش بۆی نەبوو

بڵێت وا نییە...

هیچ دیمەنێکی جوان، هەندەی دیمەنی پێشمەرگە، نەیدەبزواندم و کاری تێنەدەکردم، کە ئێواران و بەیانیان بەڕیز بە چیادا سەر دەکەوتن، یەکسەر قسەکەی مامۆستا بەکرم دەهاتەوە بیر، کە دەیگوت:

- پێشمەرگە... هەتاومان بە دیاری بۆ دەهێنن.

حەزم دەکرد هەمیشە ئاواییەکەمان پێشمەرگەی لێبێت، هەندێکیان زۆر قسە خۆش بوون، زۆربەشیان گەنج و شارنشین بوون، بە دەگمەن نەخوێندەواریان تێدا بوو، ئای کە پێم خۆش بوو لە نزیکەوە گوێیان لێ بگرم.

***

چ جارێک باوکمم وا بەتوورەییەوە نەبینیبوو، سەرتاپا دەلەرزی، چاوەکانی سوور هەڵگەڕابوون، ڕووخساری هەند گرژ ببۆوە، خەریک بوو برۆکانی بە یەک دەگەیشتن، ئەو ڕۆژە لە پۆلی شەشی سەرەتایی بووم، لە پەنجەرەی قوتابخانەکەوە چاوم تێوە بوو، بە دەنگی بەرز لەنێو خەڵکەکەدا قسەی دەکرد:

- نابێت... چۆن شتی وا دەبێت؟

هەر زەلامە بە جۆرێک لێی دەپرسی، ئەویش هەر دەیگوت:

- نابێت... چۆن دەبێت... با ئەمانە گوو بخۆن... هەر نازانن - لە خۆیانەوە قسە دەکەن... تێنەدەگەیشتم مەسەلە چییە...

پاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، بە جۆرێک دیمەنی باوکمم بینی، هەرگیز ئەو

دیمەنەم لە یاد ناچێت، بە جۆرە کزییەک و مەلولیێکی ئەوتۆ کسکۆڵەی کردبوو، دەتگوت، غەمی هەموو دنیای لە کۆڵدایە، بێدەنگییەکی سەیر هەڵنیشتبووە سەر ڕووخساری، ڕەنگی پێ بواردبوو، بە مردوویەکی زیندوو دەچوو، ئەو ڕەنگە زەردە، تا دوا هەناسەی تەمەنی ڕووخساری جێ نەهێشت، هەر لەو کاتەدا کادیرێک و دوو پێشمەرگە گەیشتنە نێو دێ، باوکم زۆر بەپەرۆشەوە بەرەو پیریان چوو، نەمزانی چ شتێکی لە کادیرەکە پرسی، بەڵام گوێم لێبوو کادیرەکە گوتی:

- بەڵێ، حاجی، وایە.

ئەگەرچی لە دورەوە وەستابووم و سەرنجم دەدا، نەمدەوێرا لە ترسی باوکم نزیک ببمەوە، بەڵام زۆر بەوردی گوێم هەڵخستبوو، چونکە قەد شتی وام لە باوکم نەبینیبوو... هەر کە بە دەنگی بەرز نەڕاندییە سەر کادرەکە، من لەلای خۆمەوە ڕاچڵەکیم.

- یانی هەر هیچ نەما... تەواو؟ ئەی ئەوە نییە ئێوە ماون، ئەی ئەوە نییە هێشتا تفەنگەکانتان بەسەر شانەوەیە...

- نا حاجی، ئەمە ڕواڵەتە... یەک - دوو ڕۆژی دی ئەمەش نامێنێت.

- فلتەفلت.

- بە سەری تۆ حاجی، تەواو - ئاشبەتاڵ - ئەوا ئێمەش، یانی من و ئەم پێشمەرگەیە، بەرەو ئێران، بەرەو ئاوایی دەڕۆین...ماڵئاوا.

- یانی تەواو... تەواو؟

- بەڵێ تەواو.

هەرگیز باوکم نەدیبوو بگریێت، فرمێسکەکانی باوکم بوونە بەنزین لە ناخی مندا و گریان تێ بەربوو، کاتێک کە باوەشی بە کادر و پێشمەرگەکاندا کرد و خواحافیزی لێکردن، هۆن هۆن فرمێسک بە گۆنایا دەهاتە خوارێ، تا ئەوساش نەمزانیبوو باوکم هەند دەنگ خۆشە، بە سۆزێکی دەرویشانە، هەندێک جاریش جۆرە هەنسکێکی دڵتەزێن تێکەڵ بە لاواندنەوە و باوکەڕۆکەی دەبوو، بەردی دەکرد بە ئاو، تا پێشمەرگەکان لە چاو ون بوون، هەر دەیچریکاند...

***

ئەو ڕۆژانە تفەنگێ قیمەتی مریشکێکی نەبوو، پێشمەرگەکان تفەنگەکانیان لێ ببوو بە بار، گەلێک جار بە بار لوغم و نارنجۆکیان فڕێ دەدا... لە ئەشکەوتێکی نزیک بە ئاواییەک و لە ناوچەکەی ئێمە، سەدان گوللەتۆپ و چەکی قورسیان تەقاندەوە... ئەگەر ئێمە لەو تەمەنەدا بمانپرسیبا بۆ وا دەکەن، پێیان دەگوتین:

- وەک ئێمە شکاین، با چەک و تەقەمەنییەکانمان دەستی دوژمن نەکەوێ.

(ئێمە شکاین)، یەکێک بوو لەو شتانەی عەقڵی ئەو سەردەمەمان قەبووڵی نەدەکرد و تێی نەدەگەیشتین... ئێمەی منداڵ گەلێکمان پێ سەیر بوو، لەوەوبەر ئەو تفەنگانەی بەسەر شانی پێشمەرگەکانەوە نیشانەی جوانمەردی و پیاوەتی بوو، کەچی لە پڕ، بە - شەو و ڕۆژێک - هەر هەمان ئەو تفەنگانە ببوونە شتێکی بێزار و فڕێ دەدران، ترسیش داچۆڕابووە نێو ناخی خەڵکەکە، تەنانەت نەیاندەوێرا سەیری چەکەکان بکەن... باوکم هەرچی پارەیێکی هەبوو، دایە چەک و فیشەک، تەنانەت ئاڕ پی جی - یشی بە نرخێکی زۆر هەرزان دەکڕی، چەک و فیشەکەکانی

دەبردە چیا و قایمی دەکردن...

پاش چەند ڕۆژێک، خەڵکی ئاوایی بە جارێک لێی هاتنە دەنگ:

- تۆ ماڵی ئێمە وێران دەکەیت... دێیەکەمان بە تالآن دەدەیت...

باوکم چ وەلامێکی نەدانەوە، بۆ ڕۆژی دوایی بە جارێک هەموو خەڵکی ئاوایی وروژاند، ئەویش لە پڕ هاتە ماڵی حەمەی خاڵم، پەلی گرتم و پێی گوتم:

- دەی حازربە و با بچینەوە بۆ ماڵی خۆمان.

قسەیەک لە مامم، قسەیەک لە خاڵم، دەبێتە دەمەقاڵە و هەموو خەڵکی ئاوایی کۆ دەبنەوە، پشتی خاڵم دەگرن و بە باوکم دەڵێن:

- حاجی، تەنانەت بە جنسیەش کوڕی تۆ نییە... هیچ حەقێکت بەسەریەوە نییە.

- کوڕی خۆمە!

پیرە مێردێکی ڕیش سپی لێی ڕاپەڕی، گۆچانەکەی بۆ درێژکرد، بە توورەییەوە پێی گوت:

- لە کەیەوە؟

- دەڵێم کوڕی خۆمە، بەزۆر بێت دەیبەم، بەخوایشت بێت، هەر دەیبەم.

تا ئێستاش سەرم لەو نهێنییە گەورە و پڕ تەلیسمە سوور دەمێنێت، چ شتێک بووە هۆی ئەوە وا باوکم کتوپڕ و بێ هیچ پێشەکیەک ئاوها

بابداتەوە، هەرچەندم كرد و كۆشام و لە خۆمم دەپرسی، چ وەڵامێكی ئەوتۆم وەدەست نەدەهێنا، بۆچی تا ئێستا، ئەو بۆ من نەك باوك نەبووە، بەڵكوو بە دوژمنی خۆی دەزانیم، چۆن بە شەو و ڕۆژێك داكۆكییەكی ئەوتۆی لەسەر كردم، چ شتێك نەیتوانی ڕێی لێبگرێت، قەتیش دوودڵی نەدەكرد، گەر كارەكە بگەشتبایەتە سەر شەڕەتفەنگ... چ كەسێكی ئاواییش نەیدەزانی چییە ئەو شتەی وا ویژدانە مردووەكەی جووڵاندووەتەوە و من بە كوڕی خۆی بزانێت...

ئای پێم ناخۆش بوو، هەر ئەو ڕۆژەی لەماڵی خاڵمەوە بردمییە ماڵەكەی خۆی، هەر ئەو ڕۆژەش لە قوتابخانە دەریكردم، سەراپای خەونەكانمی قرتاند، چەندم حەز دەكرد قوتابخانە تەواو بكەم، بە قسەی مامۆستا بەكر بكەم، هەر لە دێكەی خۆماندا ببم بە پێشمەرگە و مامۆستا، دەرس بە قوتابییەكان بڵێم... نەك هەر ئەم خەونەی من، بەڵكوو خەونی زڕبراكانم، ئەحمەد و مەحمودیشی قرتاند... ئای لە قوتابخانە یەكدیمان زۆر خۆشدەویست، پشت و پەنای یەك بووین، ئەگەرچی ئەوان هەندێك چەتوون و شەڕانی بوون، بەڵام چ قوتابییەك شەڕی لەگەڵ نەدەكردین، ڕاستەوڕاست پێیان دەگوتن: مستەفا زڕبرای ئێوەیە و برای شیری ئێمەیە، بەم حیسابە ئێوەیش برای ئێمەن، ئەحمەد و مەحمود وایان دەزانی كە منداڵان ئەم قسانە دەكەن، سەبارەت بەوەیە كوڕی حاجین و پێیان ناوێرن!

باوكم هەر سێكمانی پەلكێش كرد، بێ ئەوەی چ قسەیێك بكات بەرەو بنار بردینی، لە ژوور قووتەیەكی ڕەبزر و لەنێو چەند گابەردێكی زلدا، بن كەسێكی دەستنیشان كرد:

- ئا لێرەدا هۆدە خانوییێك دروست دەكەین... ئەم شوێنە گەلێك

چاکە... دورە دێیە و بەرزە، نزیکە ئاوە... هەموو ئاواییش دەکەوێتە بەر سێرەی تفەنگەکانمان!

ئێمە هەرسێکمان سەیری یەکدیمان دەکرد، لە مەبەستی حاڵی نەدەبووین، ئەوەندەش لێی دەترساین، نەماندەوێرا چ شتێکی لێبپرسین.

***

شەو و ڕۆژ کارمان دەکرد، پاش یانزە شەوێک، ئەوەی باوکم مەبەستی بوو، وە ئەنجامی گەیاند، پاش ئەوەش، کاری پێ دەکردین، گوێی بە قسەی چ کەسێک نەدەدا، تەنانەت بۆڵەبۆڵ و خوتەخوتی زڕدایکیشم کاری لێ نەکرد...ماڵی گواستەوە، ئەوەی زۆر پێویست بوو، هێنای، ئیدی تا دە - دوانزە ڕۆژێکی دیش لە بەرزییەکانی ئەملا و ئەولای ماڵە نوێکەمان، سەنگەری قوڵ قوڵی پێ لێدەداین... هەر بە بێدەنگی کارمان دەکرد.

ئێمە هەرسێکمان نەماندەزانی بۆچی ئەمە دەکەین... باوکیشم هیچی نەدەگوت، جارجارێک دەیگوت:

- ئەم سەنگەرە ڕێی کشانەوەی نییە، ئا لێرەوە بۆ لای خوارەوە هەڵیبکەنن... با قووڵتر بێت... یانی ئەم سەنگەرەش جوان نەگیراوە... زیاتر گڵی بکەنە سەر.

بە پێی ویستی ئەو پاچمان دەوەشاند، ئەویش گاهێک گڵی هەڵدەدایەوە و گاهێک ئەندازەی دەگرت و ئەملا و ئەولایانی هەڵدەچنی... لە دنیای دێدا برا بووین، هەر ئەوە بوو جووڵەی دانیشتووانمان دەبینی... هەر کە ئەو کارە (پێویستانەمان) تەواو کرد، ئەوجا بەناوی ڕاوەوە، هەرسێکمانی بەرەو چیا دەبرد، لەوێدا فێری دەکردین، چۆن

تەقە بە کلاشینکۆڤ دەکرێت و چۆنیش دادەژنرێت و پاک دەکرێتەوە، ئەگەرچی بە نرخی تۆڵەکە چەن کلاشینکۆڤێکی دەست کەوتبوو، کەچی خۆی هەڵینەدەگرت... دڵی بە بڕنەوەکە خۆش بوو.

سەرەتا بە تووڕەیی، پاشان بەهێوری، دەرسی دەداین و شارەزای کردین، ئەگەرچی خۆمان وەکوو هەموو منداڵێک حەزمان بە چەک و تەقەکردن دەکرد، کەچی هەریەکە پرسیارێکی گەورەتر لە تەمەنی خۆمان، سەر زاری گرتبووین، داخەکەم نەماندەوێرا بپرسین... کەمتریش تێدەگەیشتین چی بووە، باوکم بە زمانێ باسی دەکرد، عەقڵی ئەو سەردەمەی ئێمە وەری نەدەگرت، کە دەیگوت:

- ئێوە جارێ ئەم حوکمەتە ناناسن، نازانن چ دڕندەیەکە، گەر نەختێک وەخۆ کەوێت، مەگەر ئەو خوایە بزانێت چ دەکات... ئێوە جارێ نازانن چ کافر و بێئیمانێکە...

ئێمە یەکسەر حوکمەتمان وەک سەگی هار و گورگی بریندار دەهاتە بەرچاو، چاک حاڵی نەدەبووین، کە باوکم پێی دەگوتین:

- ئێوە جارێ نایزانن، ئەگەر عومر ما، ئەوا خۆتان دەزانن و دەیناسن، ئەمەیش وەسیەتی منە، ئەم حوکمەتە متمانەی پێناکرێ، بە هیچ جۆرێ دەستی لێ مەپارێزن...

ئیدی باوکم چ غەمێکی زەرعاتەکانی نەما، چ دەربەستی ئەو مانگا و چەند بزنەی نەبوو، ناوەناوە دادەبەزییە نێو ئاوایی، ئارد و شەکر و چای و ڕۆن و نەوت و وردە پێویستی دی دەکڕی، دەیهێنانەوە، کەڵەکەی دەکردن، جارجارەش بۆ یەک - دوو ڕۆژێک گوم دەبوو، لەو سەرەوە بە کۆڵێک فیشەک و ڕومانەوە دەهاتەوە.

جارێکیان دوو بزنی برد، لە سەرەوە دووربینێک و ئار پی جی - یەکی هێنایەوە... زڕ دایکەکەم زۆر تووڕە بوو...

- ئاخر ئێمە لەم شاخە چ لەم ئاسنە ڕەق و تەقانە بکەین؟

کوان بزنەکان؟

- وس بە... تۆ تێناگەیت.

- تەنها لەم بەزمەی تۆ تێناگەم... یەکێک عەقڵی هەبێ، شتی وا دەکات؟

- وس بە...

ئیدی حاجی باوکم لەسەریەک پێی دەگوتین:

- فیشەکی زەرد بۆ ڕۆژی ڕەش.

***

نزیکەی مانگێک دەبوو ژیانی نوێم دەستی پێ کردبوو، دەبا بەیانیان زوو لە خەو هەڵساباین، بەپەلە هەموو پێویستییەکانی ماڵی نوێمان دابین دەکرد، بێ ئەوەی کەسێک کارمان بەسەردا دابەش بکات، دار و ئاو و هەر ئیشێکی دی هەبا، بەبێ پێگوتن، دەستی دەدرایە...

ئەوەی من پێشوەخت سڵم لێدەکردەوە و لێی دەترسام، وا نەبوو وام دەزانی ئیدی شەو و ڕۆژ لە ژێر چەپۆکی باوەژندا سەرکوێر دەکرێم و دنیام لێ حەرام دەکات، باوکیشم هەر بەتووڕەبوون سەرم لێ تێک دەدات و هەموو شتێکم لەبیر دەباتەوە، هەر هیچ نەبێت بە فەرق و جیاوازی لەنێوان من و زڕبراکانمدا، لە ژێر کاری قورس دەمپروکێنێت،

کەچی نەک تەنها وا نەبوو، بەڵکوو باوەژنم بە پێچەوانەی ئەو هەستەم بوو، گەلێک جار منی دەکردە دەسکەلای خۆی و لە ڕووی باوکمدا دەوەستا.

- بۆ ئەوەندە ئەزیەتی مستەفا دەدەیت... تۆ زۆر ئەزیەتی ئەم منالانە دەدەیت، هێزیان تیانەمانە... کەی ئەمانە ئەم ئیشەیان کردووە؟

باوکیشم گەلێک جار بێدەنگ دەبوو، هەندێک جاریش بەئەسپایی، وەک ئەوەی بۆ خۆی بدوێت، دەهاتە گۆ:

- بۆ خۆیانە... دەبێت ڕابێن، تۆ نازانیت چ ڕۆژگارێک چاوەڕێیان دەکات.

ئەم قسەیەی باوکم دەبووە کلیل و زمانی باوەژنمی دەکردەوە:

- تۆ لای خۆت زیارەتی ماڵی خوات کردووە... چیە ئەم قسانە دەکەیت... دەڵێی ئیمانت بە خوا نەماوە، هەر لە خۆتەوە شت دروست دەکەیت، جارێ هەر هیچ نەبووە، ئێمەت بۆ ئەم چۆڵەوانییە هێناوە، بنیادەمی تیا نابینین... چی بووە؟ هیچ... دنیات لێ هاتۆتەوە یەک... بێقەزا بیت، هەموو خەڵکی ئاوایی گاڵتەمان پێ دەکەن... هەر هیچ نەبێت دەڵێن خوا عەقڵەکەیشی لێسەندووەتەوە... ئاخر کەی ئەمە ژیانە، خۆ ئێمە لەم خەڵکە زیاتر نین...

- نەخێر زیاتر نین... بەڵام چ بکەم بە قسەم ناکەن و زمانم کول بوو ئەوەندەم پێ گوتن... دەنا هەرچی شوێنی سەختی ئەم چیایە هەیە، پێیان ئاوەدان دەکەمەوە و پڕ چەکیان دەکەم:

- خۆ ناشێت بڵێیت دەبم بە قائیدیان و شۆڕشێکی دی دەکەم.

- گەر دەمتوانی... بەڵام دەتوانم ببم بە(خولە پیزە - یان).

- ترحیو... ئەوانەی پێشوو چاک تەواویان کرد، جا نۆرەی تۆیە...

- ڕاست دەکەی... چی بکەم، زۆر شت نازانم... بەڵام هەر ئەوەندە دەزانم، گەر بەرگری لە شەرەف و ناموس و کەرامەتم نەکەم، ئیتر چ پێویست بەوە ناکات بژیم.

- جا کێ دەستی بۆ شەرەف و ناموسی تۆ بردووە؟

- دەیبەن.

- ئەوە چ پیاوێکە وا خوێنی خۆی لە کاسە دەنێت و ڕوو لە تۆ دەکات؟

- ئافرەت، تێبگە... پیاو نییە، حکومەتە، حکومەت... شەرت نییە دەست بۆ من ببەن... دەس بۆ کورد دەبەن.

- جا بە تۆ چی؟

- ئەحمەق تا کەی... بیرت لە پەچەماڵین و مانگا دۆشین و هەویر شێلان تێناپەڕێت؟

- جا چی بکەین... هەر ئەوەیان فێر کردووین...

- با حاڵیت دەکەم.

- تازە نامەوێ حاڵی ببم.

- دە هەر بە کەریەتی خۆتەوە بمێنەوە.

خۆشی لە خۆت، لەگەڵ کەرا دەژیت...

وەنەبێ زڕدایکەکەم هەند گێژ و گەلۆر بووبێت... نەخێر، بە زۆر شت حاڵی دەبوو، بەڵام بە بیانوو بوو حەزی بە چۆڵەوانی نەدەکرد، دەیویست بگەڕێینەوە بۆ ئاوایی، لە ڕاستیدا من و ئەحمەد و مەحمودیش زۆر خەمی مەکتەبەکەمان بوو، نەشماندەوێرا قسە بکەین... باوکیشم وەک ئەوەی لەم هەستەی ئێمە حاڵی بووبێت، هەر ڕۆژە دەرسێکی دەداین و لەسەریەک دەیگوت:

- ئەم دەمەی من لە دەرسەکەی مەکتەبەکەتان باشترە... مەبەستم ئەوەیە بۆ ئەمڕۆتان باشترە، لە داهاتووشدا ئەم قسەیەی منتان بۆ دەردەکەوێت. لە مەکتەب فێری ئەوەتان دەکەن چوار و چوار دەکاتە هەشت... منیش فێری ئەوەتان دەکەم کە هەرگیز بە سەرشۆڕی و ملکەچی قایل نەبن، من فێری ئەوەتان دەکەم، بۆ ئەوەی نەکوژرێن، چۆن بکوژن، فێری ئەوەتان دەکەم، بە سەربەستی بژین و بە سەربەستیش بمرن، فێری ئەوەتان دەکەم، چۆن ببن بە خاوەنی خۆتان.

لەو ماوەیەدا هەموو قسەکردنێکی من لەگەڵ باوکمدا تەنها وشەی (بەڵێ) بوو و هیچی تر، بۆ یەکەم جار ویستم بپرسم، وتم:

- بابە، ئەری...

نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم، باوەشی پیاکردم، هۆن هۆن فرمێسک بە چاوانیا دەهاتە خوارێ. من لەو زیاتر گریام، نەمزانی چ بوو وایکرد، کە ئەحمەد و مەحمود و باوەژنیشم دایانە پرمەی گریان... دیار بوو هەریەکە ژیانی خۆی دەلاواندەوە... ئیتر هەنسکم خەوی لە چاوانی ئەوانیش تەراند... ڕۆژی دوایی زۆر بەئەسپایی و لەسەرەخۆ باوکم

لەگەڵ هەموومان‌دا دەدوا، لەوەوبەر گەر بە دوو - سێ فیشەک لە نزیکی نیشانەکەمان نەدابا، بەگرژ و مۆنییەوە دەیگوت:

- دەستتان بشکێت... داوەشێن... خۆ ئێوە ولاغ نین.

بەڵام ئەو ڕۆژە گەر نیو مەترێکیش فیشەکەکە کورتی کردبا، یەکسەر دەیگوت:

- ئافەرین... دەستخۆش، ئەمجارەیان دەستت هەندێک بەرزبکەوە.

نەمزانی وشەی (ئافەرینەکەی) چ سیحرێکی لەگەڵدا بوو... لەوەولا تا نیشانەکە دوورتر با، چاکترمان دەنگاوت... ئیدی پاش ئەو ڕۆژە، چ غەم و خەفەتێکی ئەوتۆم نەبوو، تەنانەت مەکتەبیشم لەبیر کرد... جارجارە کە باوکم دەچووە خوارێ، لەنێو دێدا سەعاتێک - دووان دەمایەوە، هەر مەبەستی ئەوە بوو هەواڵێک بزانێت، هەموو جارێکیش کە دەهاتەوە، دەیگوت:

- وەزع بەرەو خراپتر دەڕوات.

ئیدی منیش بێ سڵکردنەوە بە پرسیاری گەورەتر لە تەمەنی خۆم گەمارۆم دەدا، تا بۆی باس کردم، کە حکومەت نیازی وایە دێیەکان کاول بکات، پرسیم:

- باشە چۆن ئەم هەموو دێهاتانە کاول دەکات؟

- باوەڕ ناکەم هەمووی کاول بکات... جارێ لەو دێیانەوە دەست پێدەکات، کە نزیکی سنوورن.

- وا بێت ئەم دێیەی ئێمەیش کاول دەکات.

- ئەی بۆچی هەموو خەڵکی ئاوایی وەکوو ئێمە ناکەن؟

- ئەمەیان خۆتان دەیزانن... دەنا دوو - سێ ڕۆژ لەمەوبەر - لە دێدا بیستم - هەندێک دێیان نەک بە بلدۆزەر، بەڵکوو بە دەنەمێت ماڵەکانیان تەقاندووەتەوە، هەرچی داری بەبەری دێیەکانیش هەیە، هەر هەموویان سووتاندووە.

- بۆ؟

- ئەی چەند جارم پێگوتن... لەبەر ئەوەی کوردین!

- چاکە، عەبدی خوا نین؟... مامۆستا بەکر دەیووت، لەلای خوادا فەرق و لە بەینی کورد و عەرەب و تورک و فارس نییە.

- لای خوا وایە... بەڵام ئەمانە دوژمنی خوان.

- یانی کافرن؟

- هەر زۆر، کافری موتڵەقن.

- وابێت کوشتنیان حەڵاڵە؟

- بە حەجێکە، لەو دنیادا خوا لە ئێمە ناپرسێت: چەن حەجت کردووە یا چەن نوێژت کردووە... نەخێر، لە ئێمە دەپرسێت: چەن داگیرکەرتان کوشتووە، چەن دوژمنی خوات تۆپاندووە... تا ژمارەیان زیادٗ بێ ئەجرەکەیشی زیاتر دەبێت... سەرەڕای ئەوەی خوا ڕازی دەبێت ئێمەیش سەر بەرز ئەبین و میللەت لێمان ڕازی دەبێت... جا وەرن هەرسێکتان سوێندم بۆ بخۆن و بڵێن: تا ماوین بە هیچ جۆرێک نە بە دەم و نە بە کردەوە، لە داگیرکەر نزیک نابینەوە و تا خوا هێزی

پێداوین، لێیان دەکوژین.

هەرسێکمان بە یەک دەنگ گوتمان:

- بە چی سوێند بخۆین؟

- بە خوا، بە کوردستان.

هەر سێکمان بە دەنگی بەرز گوتمان:

- سوێند بە خوا و بە کوردستان، تا لە ژیاندا بین، ژیان لە داگیرکەر بکەین بە جەهەنەم و بە جەهەنەمیشیان بسپێرین...

بزەییێکی ئەوتۆی خۆشبەختانە نیشتە سەر لێوانی باوکم، چ جارێک ڕووخساریم وا بە نوورانی و گەشییەوە نەبینیبوو...

وردەوردە باوکم هەواڵی سەیر سەیری بۆ دەهێناین:

- فلانە کەس، ئەوا بەرەو شار ماڵ و منداڵی پێچایەوە... فلانە کەسیش خەریکە موڵک و ماڵەکەی هەرزان فرۆش دەکات، کەسیش نییە لێی بکڕێت... فلانە کەسیش مرخی لە ئێران خۆش کردووە و خۆی بۆ ئەوێ ئامادە کردووە...

پاشانیش بە جۆرە بزەییێکی تەوس ئامێزەوە پێی دەگوتن:

دەک داوەشێن... خۆ ئەمڕۆیش بە عەبە خڕە و عەولا ڕەشم گوت: پیاوی چاک بن، کچی عازەبتان هەیە، خۆ دەرباز بکەن، ئەگەر ناتوانن بێنە چیا و هۆدەیەک دروست بکەن و دەست بدەنە تفەنگ، ئەوا بۆ خۆتان خەمی شوێنێک بخۆن، بچنە شار، یا هەر شوێنێکی دی... خۆ دەرباز بکەن، کەچی ئەوان بە هەموو عەقڵێکی خۆیان گوتیان: خوا چی

بۆ نووسیبین، هەر ئەوەیە... منیش پێیانم گوت:

خوا فەرموویەتی، ئەگەر خۆت نەپارێزیت، ناتپارێزم...

لە ڕاستیدا من تا ئەم دوایەش هەر وامدەزانی ئەم قسەیەی باوکم ئایەتە! بە ئایەتیشم دەزانی...

ئیدی باوکم، هەند ئیشی پێنەدەکردین، بەیانیان زوو، پێش خۆرهەڵاتن، بێڵ و پاچ و وایەر - کە زۆری چنگ کەوتبوو - هەڵدەگرت و ماینەکوێتی بار دەکرد لە هەندێک پارچە (ئاسنی زل زل) کە زۆر جار پێی دەگوتین: وریای ئەو ئاسنانە بن، ئەوان (لوغم)ن، نزیکی نەبنەوە - دەڕۆیشتن، لە گەڕانەوەدا دەیگوت:

- ئەم ئیشانەیشم تەواو کرد...

من بۆم هەبوو بپرسم، پێم وابوو گەر نەشمپرسیبا، خۆی باسی دەکرد، بۆیە پرسیم:

- چ ئیشێک؟

- ئەو گردە بەرزەی لای ڕۆژهەڵاتی ئاوایی دەبینیت...

- بەڵێ، ئەوە قوتەی نێرییە.

- ئافەرین... ئەی ئەو بەردە زلانەی سەر ئەو قوتە بەرزەی خۆرئاوای ئاوایی دەبینی.

- بەڵێ، ئەویش(قەڵای فەروغە).

- ئافەرین، دەم خۆش... ئا لەو دوو شوێنە، دوو سەنگەری نایابم

هەڵکەندووە، بەجوانی سەریشم گرتوون... سەنگەرن ئەمما سەنگەر، تۆپیش کاریان لێناکات... ڕێی کشانەوەم بۆ ساز داون، هەر لەو دوو شوێنە وایەرم گەیاندووەتە دوو (لوغمی) گەورە، لە پەنای ڕێیەکەی خوارووی ئاوایی دامناون... مەترسن، ناتەقن، بە پاتری دەتەقێندرێن، زوو لە پێشمەرگەکانەوە فێربووم چۆن دەتەقێندرێت.

- باشە باوکە، ئێمە گەلێک لە ژووررووی ئاواییداین...

- ئەو دوو سەنگەرە بۆ؟

- ئەی نازانن شەڕ فڕوفێڵی خۆی هەیە... دەبێت پێش هەموو شتێک دوژمن چەواشە بکرێت.

- چۆن؟

- پاشان تێی دەگەن!

چەند ڕۆژێکی دی لەوێدا ماینەوە، هەر کە باوکم دەچووە ئاوایی و دەهاتەوە، خەبەرێکی تازەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا: (فلانە دێیان بە گەورە و بچووکەوە سووتاند) ئەمە خەبەری ڕۆژانەمان بوو...

بەرەبەیانێک باوکم نەڕاندییە سەرمان:

- دەی کوڕینە هەڵسن، ئەوا هاتن.

***

تەپوتۆزێکی سەیر، دەتگوت ڕۆژی حەشرە، دەیان سەیارەی زیل و مودەرەعە و مغاویر بەرەو گوندەکەمان دەهاتن... باوکم دەستی دایە دووربینەکەی، بەوردی بەرەو خوار دەیڕوانی... کەیفخۆشی سەرتاپای

گرتبووەوە، وەک ئەوەی لە مێژە چاوەڕێی ئەم ڕۆژە بێت، ئاوها لەنێو بەختەوەریدا بوو... وەخۆ کەوت، یەکە یەکە دەستنیشانی سەنگەری بۆ کردین... پێی گوتین:

- ئەگەر فریاکەوتن! - ئەمەیان قەت باوەڕم پێی نییە - لێتان نزیک بوونەوە، نەک دورە تەقەیان لێبکەن، لێگەڕێن تا بە تەواوی دێنە بەردەستتان، حاڵی بوون؟

ئێمە چ قسەیێکمان پێنەبوو جگە لە (بەڵێ).

دایمەزراندین، هەریەکە بە چەکی دیاریکراوی خۆیەوە چووینە نێو سەنگەرەکانەوە... باوکیشم بەپەلە ئار پی جی یەک و سێ گوللە و برنەوەکەی لەسەر پشتی ماینەکە بەست و کلاشینکۆڤەکەی لە شان نا... پێش ئەوەی سواری ماینەکوێت بێت دووبارەی کردەوە.

- وەک پێم گوتن، تا زۆر نزیک نەبنەوە، تەقەیان لێنەکەن... سەرپێچی نەکەن...

زڕدایکەکەم، وەکوو من و هەر دوو براکەم، خۆی لە سەنگەرێکدا قایم کرد... باوکم بە سواری، وەک تیسکەی تفەنگ بەرەو خوار داکشا، لە پایینی ئاواییەوە بە چەمەکەدا بەرەو (قوتەی نێری) چوو و، لە چاوی ئێمە ون بوو... چ جارێک ئەوەندەی ئەو ڕۆژە نەترساوم. نەمدەزانی لە چی دەترسم، لەرزم لێنیشتبوو، دەست و پەنجەکانم گۆی نەدەکرد، هەناسەبڕکێیەکی سەیر ڕووی تێکردبووم... ئاگام لە براکانم نەبوو، چونکە هەریەکە لە سەنگەرێکدا بوون، نەمدەزانی ئەوانیش وەکوو من دەترسن یا نا... خۆ ئەگەر ئەوانیش منئاسا ترس گەمارۆی دابن، باوەڕ ناکەم، (پاشان) دانیان بەوە نابا کە ترساون... چونکە گەر ئەوان یا باوکم

لێی پرسییام (ئەرێ ترسای)، بەدڵنیاییەوە درۆم دەکرد و دەمگوت: نا... چونکە لەو ڕۆژانە و لەو دنیا تایبەتییەی ئێمە، جگە لە ترس، چ عەیب نەبوو... جا چۆن ئەو عەیبەم دەنا بە تەوێڵی خۆمەوە؟

دیار بوو خەڵکی ئاواییش وەئاگا بوون، بەڵام چ جووڵە و فزەیان نەبوو، سەیارە و مودەرەعەکانیش، بەبێ ترس بەرەو ئاوایی ملی ڕێیان گرتبوو و بەرودوا دەهاتن...

دە دەقیقە...

ماوەیێکی کەمە، کەچی لەلای من تەمەنێک بوو... تەمەنێکی درێژی پڕ لە کارەسات... داهاتوویێکی ئاڵۆزی گرتبووە خۆیەوە... دە دەقیقە!

عەقڵی ئەوسام نەیدەتوانی بەوردی ڕوو لە سەرئەنجامی ئەو دە دەقیقەیە بکات... هەزاران نیگا و وێنەی جۆربەجۆر و سەیر سەیر بە مێشکمدا گوزەریان دەکرد... لە سەرەتادا، وام هەست دەکرد باوکم دەکوژرێت، ئێمەش بێ دەرەتان دەبین، لە شاراندا بە ئاوارەیی و بێنەوایی دەسوڕێینەوە، دەکەوینە بەر تانە و تەشەری خەڵک، برسییەتی و بێ جێیی دەبێتە قولاپ و لە گەروومان گیر دەبێت، وردەوردە بەرەو مەرگێکی خەجاڵەتئامێز هەنگاو دەنێین... هەرچۆنێک سەیرم دەکرد (ئەوان) بە مەزەندە لە دوو سەد کەس کەمتر نەبوون - جگە لە مودەرەعە و سەیارە - باوکم تاقە نەفەر بوو... چی پێ دەکرێت؟

چەنی پێ دەکوژرێت؟ دوایی هەر دەیکوژن... ئەوجا ڕوو لە ئاوایی دەکەن، ئەو زەلامانە کۆ دەکەنەوە، کە عارەبی دەزانن، پاشانیش بۆ چاو ترساندن پێنج شەش کەسان دەکوژن و ئەوجا دەست بە تالان دەکەن... ئەم وێنانە لە بەرچاومدا سەمایان دەکرد، بێئاگا و بە دەنگی

بەرز خۆمم دەدواند:

- (تۆ بڵێی خاڵە حەمەم نەکوژن... شێتۆکەیە، لە خۆڕا قسان دەکات... خۆ دەزانێت بە عارەبیش جنێو بدات).

لەنێو ئەم خەیاڵانەدا دەڵەرزم و گرمەیێک ئەو ناوەی هەژاند... ئەو مغاویر و سەربازانە وەک ئەوەی گەلەگورگ تێیان بەربووبێت، هەموو ڕەوینەوە، هەریەکە بە لایەکدا لەنێو تەپ و تۆزێکی خەستدا ون بوون... هێشتا دەنگەکە بە تەواوی نەڕەویبووەوە، ناڵەی ئار پی جی یەک هات و زیلێک بەلەخورد بوو، هەر پاش ناڵەکە، چەند سەڵییەێکی لەسەریەکی کلاشینکۆڤ درەوی ئەو مغاویر و عەسکەرانەی کرد... ئیدی لە هەموو لایەکەوە تەقە هەڵسا، کەم کەس دەیتوانی بزانێت لە کوێوە بەرەو کوێ تەقە دەکرێت، ناڵەیێکی دیی ئار پی جی، زیلێکی تری کردە گڕی سوور و پەڵە دووکەڵێکی ڕەشی نایە سەریەوە و بەرەو ئاسمانی نارد... نەخێر، ناڵەیێکی دی، لەبەر خەستی تەپوتۆز نەمزانی ناڵەی سێهەم چی کرد... تەقە ئەوەندە گەرم بوو، کوێرانە هەر چواردەوریان دەبێژا... تەواو شێتگیر ببوون، بە جۆرێکی ئەوتۆ شڵەژابوون و پەرت ببوون، هەر گوللەی خۆیان بەر خۆیان دەکەوت... نیو سەعاتێک زیاتر تەقە، بەو خەستی و گەرمییە بەردەوام بوو، ئەوجا مودەرەعەکان بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئاوایی بە تەقەکردنێکی کوێرانەوە کەوتنە ڕێ، لە پڕ ناڵەیێکی گەورە لەلای ڕۆژئاوای گوندەوە، هەموو وردە تەقەکانی قوت دا و ڕووی بە مودەرەعەکان وەرچەرخاند... تەپوتۆزێکی خەست بەرز بووەوە... ئێمە هەموو گەلێکمان لا سەیر بوو، خۆ باوکم سێ گوللە ئار پی جی پێ بوو، ئێمە بە چاوی خۆمان بینیمان بەرەو ڕۆژهەلات کەوتە ڕێ... بزەیێک دایگرتم و لەبەر خۆمەوە گوتم:

- (تۆ بڵێی هێشتا هەندێک پێشمەرگە مابن و بە دەنگی تەقەکانەوە هاتبنە هانای باوکم)؟

بەرانبەر بەم هەستەم دوودڵ بووم، چونکە باوکم دەیان جار دەیگوت:

- حەیفێ بۆ ئەم نازدارانە، ولات چۆڵ دەکەن، هەر یەکەیان بەرانبەر بە هەزار پیاوی دوژمنە... لەگەڵ ئەم وەزعەشدا، ئەگەر دە پیاوم لەگەڵ بێت، دۆشکا و تەیارە شکێن و تۆپیش دەهێنمە ئێرە... بەلام سەد حەیف!

هەر چی ترسێک لە دەروونمدا هەبوو، رەوییەوە، خەریک بوو تووشی شاگەشکە بم - کە پاش سەعاتێک - هێشتا عەسکەر و زێل و مودەرەعەکان کوێرانە بە دەوروبەردا تەقەیان دەکرد و مەیتەکانیان هەڵدەگرت و پاشەکشەیان دەکرد، باوکم لە پایینی ئێمەوە دەرکەوت، بەرەوپیری چووم، خەریک بوو یەکسەر پێی بڵێم (چاک پێشمەرگەکان فریات کەوتن) کەچی تێی خوڕیم:

- خۆت دەرمەخە...

گەڕامەوە، پاش ئەوەی ولاخەکەی بردە جێیەکەی خۆی، زۆرم پێ سەیر بوو، ئار پێ جێ یەکەی گوللەیێکی بەسەرەوە بوو، گوللە ئار پێ جێ یەکی دیشی بە دەستەوە بوو... هەموومان خەریک بوو لە خۆشیا پەڕوپۆ دەربکەین و بفڕین، باوکم بەبێ هیچ قسەکردنێک، لە سەنگەرێکدا خۆی مات دا، بە دووربین سەیری کاروانی عەسکەری بەزیوی دەکرد، جارجارەش یەک دوو تۆپ بەر ئاوایی دەکەوتن، تەپوتۆز و دووکەڵێکی رەشی لەنێو گوندەوە بەرز دەکردەوە... بووە چاشتنگاو، تەقە بەرەو کزبوون دەچوو، بەشێکی تەواوی خەڵکی ئاوایی فریای خۆ کەوتبوون، بەشێکی کەمیش هەر پەرت و بلاو بوون، باوکم کۆی کردینەوە، گوتی:

- ڕەنگە (ئێستا) تەیارە بێت.

باوکم گەلێک پەرۆشی ئەو بەشە ماڵ و منداڵانە بوو، کە سەریان لێ تێکچووبوو و نەیاندەزانی ڕوو لە کوێ بکەن، بەیناوبەینیش، دورە تۆپ لە نزیکیانەوە دەکەوتە زەوی، ئیدی ئەوانیش بە دۆڵ و بە چەما هەر ڕایاندەکرد... خۆمم پێ نەگیرا جارێکی دی بە باوکمم گوت:

- باوکە، چاک پێشمەرگەکان فریات کەوتن.

تەنها بزەییێکی سارد نیشتە سەر لێوانی و هیچی تر... هەندێک لە خەڵکی دێ بەرەو چیا، هەندێکیان بە دۆڵەکاندا ترس ڕاوی دەنان، هەندێکیش وا سەریان لێ تێکچوو بوو، بەرەو جادەی قیر ملی دەنا، ئەوەی ئازا بوو گەیشتە بنار، لەنێو گابەردەکاندا خۆیان حەشار دەدا، هەندێک سەڵتەزەلامیش ملیان بە چیاوە نا، هێشتا نەببووە نیوەڕۆ، گرەگرِی تەیارە گوێی کاس دەکرد، توانیم شەش هەلیکۆپتەر بژمێرم... باوکم بەپەلە پێی گوتین:

- خۆتان لەنێو سەنگەرەکانتان قایم بکەن... بە هیچ جۆرێک نەجووڵێنەوە...

دوو هەلیکۆپتەر، بناری چیا و ناوقەدی چیای دادەبێژا ئەو چوارەی دیش بەوپەڕی ڕقەوە ئاواییان دەکردە ئاگر و دووکەڵ، تەڕ و وشک بەدەم ئاگرەوە قرچەی لێوە دەهات، قوتابخانە و مزگەوت و سەرلەبەری خانووەکان خاپوور کران و داتەپین... هەر کە هەلیکۆپتەرەکان گەڕانەوە، وام دەزانی جارێکی دی عەسکەری بۆ دێ، بەڵام چڕەدووکەڵێکی ئەوتۆ بوو، دەیخنکاندن، باوکم گوتی:

- ڕەنگە سبەی... یا شەوێ بۆی بێن.

ئـەو ڕۆژە لەنێـو سـەنگەرەکان، نانـی نیوەڕۆمـان لـە سـەعات چـواری ئێـوارەدا خـوارد، شـەو داهـات، مانـگ لـە چیاکـەی پشـتمانەوە، دەیڕوانییـە ئـەو دووکەڵـە خەسـت و چـڕەی دێـی بێدەنـگ، کـە گاهـ لەگـەڵ ( - بـا - دا) دەگەشـایەوە، گاهیـش لـە هەندێـک شـوێندا دادەمرکایـەوە...

باوکم پێی گوتین:

- کوڕینە، دەبێت ئەمشـەو زۆر وریا بین.

گەلێک حـەزم بـەوە بـوو باوکـم وەڵامێکی ڕاستەوڕاسـتم بداتـەوە، دڵـم زیاتـر خـۆش بـکات، کـە هێشـتا پێشـمەرگە مـاون... بۆیـە گوتـم:

- باوکـە... پێشـمەرگەکان، هـەر هەمـان ئازاکانـی جارانـن... چەنـد زوو فریـات کەوتـن!

وەک ئـەوەی ناچـار بێت وەڵام بداتەوە، پێی گوتم:

- نەخێر، کـەس فریام نەکەوت.

- چۆن؟

- چاک.

- ئـەی ئـەو هەموو تەقانە...

- هـەر خۆم بووم.

- باوکـە، ئێمـە چاومـان تێـوە بـوو، تـۆ بەدۆڵەکـەدا بـەرەو ڕۆژهـەڵات چوویـت.

- ئەمە ڕاستە.

- ئار پی جی یەکەت سێ گوللەی لەگەڵ بوو، بەڵام کە گەڕاشیتەوە، دوو گوللەت پێ مابوو.

- ئەمەشیان ڕاستە.

- ئەی ئاخر چۆن؟

- ئەی پێم نەگوتن، شەڕ فرت و فێڵی خۆی هەیە... پێم نەگوتن، گورزی سەرەکی ئەوەیە دوژمن چەواشە بکرێت...

- بەڵێ وات گوت بەڵام...

- بەڵامی چی؟ دەمزانی هەر دێن... کوڕی ئەم ناوچەیەم، وەکوو دەم و دەست و لووتی خۆم، دار و بەرد و تەلانەکانی شارەزام... لەلای ڕاستی دێ و لە چاکترین شوێنی بەرزیا سەنگەرم هەڵکەندبوو و بانییم گرتبوو، گوللە ئار پی جی و پاتری و وایەری لوغم-ەکە و فیشەکی زیاد و مەتارە ئاوم تیادا شاردبووەوە... ڕێی کشانەوەم بە کۆلێن دروست کردبوو، تەنانەت لە شێوەی نیمچە سەنگەرێکی قووڵ لە دۆڵەکەدا جێی ولاخەکەم چاک کردبوو بەچاکیش بەستبوومەوە... بە هەمان دەستوور، لای ڕۆژئاوایش، سەنگەر و گوللە ئار پی جی و وایەر و فیشەکی زیاد و مەتارە و ئاوم حازر کردبوو و چاوەڕێی ڕۆژێکی ئاوهام دەکرد، ناڵەی یەکەم: لوغم بوو، دووەم: ئار پی جی، ئەو دوو - سێ دەستڕێژەش وای لێیان کرد، وا بزانن بەلای کەمەوە دە دوانزە کەسێکن تەقەیان لێ دەکەن...

هەر کە ئەوان شڵەژان، ئیدی من گورز بە دەست بووم و نۆبە

گوررزم لە دەست نەدا، ناڵەی دووهەمی ئار پی جی یەکە: کەوکوژی بوو، بەڵام ناڵەی سێهەمی: سەگ ڕەوێن بوو، ئیدی ئەوان وا شڵەژان، پێیان وابوو بەتالیۆنێکیان بۆ هاتووە، تا ئەوان وەخۆ کەوتن، بۆ ئەوەی ڕوو لە شوێنی تەقەکان بکەن، من بەپەلە کشامەوە، بە پاینا و بەنێو دۆڵە پڕ لە سپیدارەکەدا بەرەو ڕۆژئاوا تاوی ماینەکوێتم دا، کەمتر لە دە دەقیقە خۆم گەیاندە نێو سەنگەرەکەی (قوتەی فەروغ) بێ ئەوەی هیچ شتێک لەسەر لوغمەکان بێت، ڕاست و چەپ باتریەکانم دانا، وایەرەکانم پێوە بەستن... ناڵەی لوغمەکە ڕووی بە هەموویان وەرچەرخاند، ئار پی جی یەکم بەرەو ئاسمان تەقاند، چونکە بە هیچ جۆرێک نەدەگەیشتە ئەوان، مەبەستم ئەوەبوو لە ئاسماندا بتەقێتەوە... بیانشڵەژێنێت. بەلای کەمەوە وا بزانن قوەتی تر هاتووە یا دەوریان گیراوە... ئیتر بۆڕەی (پیرە برنەو) هات بە کەیفی خۆم سێرەم لێدەگرت... شەڕیش هەر ئەوەندەی قورسە تا دوو - سێ کەسێکیان لێدەخەیت... ئیدی وای لێدێت سەگ ساحێبی خۆی نەناسێتەوە...

ئەو شەوە، جگە لە هەندێک گرمەی تۆپ هیچ شت نەبوو... بەیانی زوو دیسانەوە بە دەنگی گرمەگرم وەئاگا هاتینەوە... هەر هەموومان لە ئاستی باوکمدا بێدەنگ وەستابووین، ئەویش خۆی تێک نەدا و هەر ئەوەندەی گوت:

- بە هیچ جۆرێک لەنێو سەنگەرەکانتان نەجوولێنەوە... تا تەواو نزیک نەبنەوە، کەس تەقە نەکات... نەخێر هەر تەقە مەکەن تا خۆم تەقە دەکەم، چونکە ئەوان شارەزای ئەم شوێنە نین، قەتیش باوەڕ ناکەن و عەقڵیشیان نایبڕێت ئێمە لێرەدا بین.

خۆمم پێ نەگیرا، بە حەزێکی بێپایانەوە ڕووم لە باوکم کرد:

- ئەی وەکوو دوێنێیان لێناکەیت؟

- نەخێر... شەڕی خۆترپێن ناکەم... ئەمەیان دەبێتە بێعەقڵی... ئەمجارەیان لەلایەکەوە نایێن، لە چەند لایەکەوە دەکەونە ڕێ، پێشەکی لە دورەوە گەمارۆی دێ دەدەن...

هەرگیز ئەوەی دوێنێ دووبارە نابێتەوە... دوێنێش وەک دوێنێ نەدەبوو، ئەگەر لە دێهاتەکانی دیدا چەند کەسێک ئەمەیان غافڵگیر کردبا... لەم ماوەیەدا چووبنە هەر دێیەک، چ کەسێک تەقەی لێ نەکردوون، وایان زانی ئێرەش... مەگەر حاجی مردبێت!!

ئەو ڕۆژە وەک باوکم گوتی، لە سێ - چوار قۆڵەوە بە قەوەتێکی ئەستورەوە هاتن... پێشەکی ئاوایی خاپووریان تۆپباران کرد، پاشان بۆی چوون، ئەگەر ئەو ڕۆژە باوکم تەقەی بکردایە، بەلای کەمەوە دە دوانزە عەسکەر و مەغاویر لە بەردەستمان بوون، بەڵام باوکم چ تەقەی نەکرد، ئێمەیش فزەمان لە خۆ بڕیبوو، بە جوانی چاومان پێوە بوو چۆن بەدەنەمێت، ئەو چەند پایەیەی مزگەوت و قوتابخانەکەیان تەقاندەوە، چۆنیش تێزاب - یان بە دارەکاندا دەکرد و ئاگریان تێبەردەدان، ئاوایی خاپووریان داتەپاند، لەگەڵ زەویدا یەکسانیان کرد، ئێوارەیش گەڕانەوە... هەر نەختێک دنیا تاریک بوو، ئاسمانی ئاواییەکانی ئەو دەوروبەرە بوو ڕەش دەچووەوە... هەموو هەر خەفەتبار بووین، وامزانی ئیدی چ ئاوەدانییێک نەماوەتەوە بمانگرێتەخۆ... لە باوکم پرسی:

- باوکە، زۆر نزیک بوون... بۆ تەقەت نەکرد تا ئێمەش...

- ئێوە ئاگاتان لێنەبوو، ئەو کەڵەکە بەردانەی ژوور قووتە بەرزەکە سەرمانەوە عەسکەری پێوە بوو، لەبەر ئەوەی سەنگەرەکانی ئێمە بانی

گیراوە و چ شوێنەواری ئینسانی پێوە دیار نییە، ئەوان بە هیچ جۆرێ هەستیان بە ئێمە نەدەکرد... گەر تەقەمان کردبا، ئەوا گەمارۆ دەدراین و لەناو دەچووین... لەبەر سەرنجدانی ئەوان چ ئاگام لە دێ نەبوو... ترسی ئەوەم هەبوو ئێوە بجووڵێنەوە یا تەقەیێک بکەن...

ئیدی ڕێی چ پرسیارێکی دیمان نەبوو... کەسێکمان نەیپرسی ئەرێ چی بکەین - کە پاش ئەوەی غافڵ گیراین کات چی تر دەکات.

***

سێ مانگی بەهار تێپەڕی... دوو مانگ دەبوو جگە لە یەکدی، کەسمان نەدەبینی، باوکم و زڕدایکەکەم هەمیشە بۆڵەیان بوو، من و هەر دوو براکەم ڕۆژ بە ڕۆژ برایەتیەکەمان دەبووە هاوڕێیەتییەکی بەتین، مانگی یەکەمی بەهار لەو بنارەدا بە تاقەماڵێ ژیانمان بەسەختی دەگوزەراند، وێڕای ترس، کاری ڕۆژانەشمان زۆر بوو، بەڵام دوا مانگی بەهار، ئەشکەوتێکی بەرین ئێمەی گرتبووە خۆیەوە، ئەشکەوتەکەمان نزیکی ترۆپک بوو، ژیانمان بە تەوەزلی دەگوزەراند، کانیاوێکی نزیک، ئازوقەیێکی چاک، دارێکی زۆر، تەنانەت گۆشتێکی زۆریشمان هەبوو، چ بەوەی باوکم بە تفەنگ ڕاوی دەکرد، چ بەوەیش ئێمە تەپکەمان دەنایەوە... لە دنیای ئاوەدانی دابڕاوین، چ هەواڵێکمان نەدەزانی، دنیای ئێمە دنیای پێنج کەس بوو... هەر پێش وەخت باوکم ئەم ژیانەی خستە بەرچاومان، ئەویش هەر پاش ئەوەی دوو ڕۆژ بەسەر سووتاندنی دێیەکەمان تێپەڕی، باوکم بە شەو ماینەکوێتی بار دەکرد و تا بەرەبەیان یەک - دوو کاروانی دەکرد، بە دوو - سێ شەو هیچی نەهێشتەوە، هەموو شتێکی گواستەوە، لە بەرەبەیانێکی زوودا، هەموو بەرەو ئەشکەوتەکە سەر کەوتین... دەوروبەری ئەشکەوتەکە گەلێک سەخت

بوو، ناوی ئەشکەوتەکەش (ئەژدیها) بوو... دابڕان لە خەڵکی و توانەوە لەنێو دنیای پڕ سیحری سروشت، جۆرە هەستێکی تایبەتی پێ بەخشین، ئەویش تێکڕا وامان دەزانی، ئەو چیایە، ئێمە بە نەوەی ئەمەکداری خۆی دەزانێت و پشتمان تێ نەکردووە... من بۆ خۆم وام هەست دەکرد دار و بەردەکەی ئەندامی لەشی منن، ئای شەوانی ساماڵی چ خۆش بوو، ئاسمانەکەی چەند جوان بوو، بەرەبەیانی هێمنێکی خواوەندانەی ئاڵاندبووە خۆیەوە... جارجارێکیش باوکم بۆ یەک دوو ڕۆژێک گوم دەبوو، تفەنگەکەی دا دەنا و دەمانچەی لەژێر پشتوێن دەبەست، پێش ئەوەی بڕوات دەیگوت:

- مستەفا، پێویسیت ناکات هیچت پێ بڵێم... تۆ گەورەی ماڵیت...

گەلێک دڵم بەو قسەیەی خۆش دەبوو، گەلێک جار حەزم دەکرد باوکم دابەزێتە خوارێ بۆ ئەوەی پێم بڵێت تۆ گەورەی ماڵی!

هەر کە دەگەڕایەوە، هەر هەموومان لە دەوریا کۆ دەبووینەوە، تامەزرۆی هەواڵی شتێک بووین، ئەویش یەکسەر بەزەردەخەنەوە دەیگوت:

- چاکە... زۆر چاکە... هەر ئێمە نین... دەیان کەسی دی بە چیاکانەوە ماون.

زڕدایکەکەم بەم قسەیەی قەڵس دەبوو، ئەو حەزی دەکرد باوکم باسی ئەوە بکات چی کردووە، لە چ شوێنێکدا داماندەمەزرێنێت، چونکە هەمیشە پێی دەگوت:

- خۆ تا سەر لێرە نابین... گوتمان هاوینیشی تیا دەگوزەرێنین و ئیدارەی تیا دەکرێت، ئەی بۆ پاییز و زستان چی بکەین... خۆت دەزانیت

زستانی ئێرە چ زوو سارد دەبێت و بەفر دەبارێت... پیاوەکە، شتێک بۆ ئەم منداڵانە دابین بکە...

باوکیشم وەک ئەوەی گوێی لە قسەکانی نەبووبێت، بەردەوام دەبوو لەسەر قسەکانی خۆی:

- ئەمجارەیان هەواڵی خۆشترم بیستووە... گەلێک پێشمەرگە و ئەهالی بە چیاوەن، خەبەر وایە پەیوەندی بە یەکدییەوە بکەن، دەڵێن گوایە لە شارەکانیشەوە، هەندێک گەنجی خوێنگەرم بەرەو چیا کەوتوونەتە ڕێ. گەر وا بووایە، چیمان دەویست، ئەوا ڕووزەردی لای خوا و پێغەمبەر و میللەت نەدەبووین.

باوکم بە جۆرێ ئەم قسانەی دەکرد، وەک ئەوەی غەمخۆرێکی گەلێک گەورەی میللەت بێت، چ شتێک بەلای باوکمەوە، هەندەی باسی کورد و پێشمەرگە و خاکفرۆش نەبوو، کەمتر دەربارەی شتەکانی تری ژیان قسەی دەکرد، ڕاستتر، هەر لە بیری نەمابوو، چوارچێوەی هزری تەنها کورد بوو، جێی چ شتێکی دیی تیادا نەدەبووەوە، پێی وابوو گەر وا نەبێت، ئەوا مردنی چاکترە، خۆی وەتەنی:

- خوا دەیزانێت لەم ڕۆژە ڕەشەی کورددا، گەر بۆ کورد نەبم، ئەوا بە بێئیمانی دەمرم.

گەلێک جاریش لەنێو وشەی زل زلدا مەبەستی خۆی تێکەڵ دەکرد، مەبەستی ئەوەبوو بڵێت (بێئیمان ئەو کەسانەن، تەماح لە ئەرز و خاکی خەڵکی دی دەکەن)، داگیرکەر تەنها ئەرز داگیر ناکات، بەڵکوو شەرەف و نامووس و کەرامەتیش دەخاتە ژێر پێ. پێی وا بوو ئەوەی خاکی داگیرکراو بێت و بێدەنگ بێت، ئەوا گەر دەست بۆ نامووسیشی ببرێت،

هەر بێدەنگ دەبێت... باوکم بە دەنگی بەرز دەیگوت:

- دەستم سەوز دەبێت گەر داگیرکەر بکوژم.

***

دوا مانگی بەهار تەواو ببوو، کەچی لەلای ئێمە وەک ئەوە بوو لە سەرەتای بەهاردا بین، تازە دارەکان چرۆیان دەکرد، گژوگیاش سەریان بەرز دەکردەوە، هەوای ساف و بێدەنگ وزەی بە جەستەمان دەبەخشی، چوست و چالاک، شەوان زوو دەخەوتین، تاریک و ڕوونیش هەڵدەساین...

گەلێک جار دووربینەکەی باوکمم هەڵدەگرت، بەرەو لایێک، پەنا بەردێک، کەپرێک، دەچووم تا چاوی دووربینەکە بڕی کردبا، سەرنجم هەڵدەدا، لە پێشدا سەیری بنار و جێی ئەو خانووەی کە لەم یەک - دوو مانگەدا ترس و خەونی ڕەنگاوڕەنگی مژیبووم، دەکرد. ئەوجا سەنگەرەکانی دەوروبەری، یەکەیەکە دەمدانە بەر سەرنجی پڕ لە حەز و خۆشەویستیم، وەک ئەوەی فریشتەکانی خواوەند پارێزەریان بووبێت ئاوها وەکوو خۆیان مابوونەوە، سەریان هەر گیرابوو، ئیدی سەرنجم بەرەو دێی خاپوور هەڵدەدا، چەشنی کۆترێکی ماڵی، یەکسەر سەرنجم بۆ جێی قوتابخانەکەمان دەچوو، وەک لانەشێواوێک بە دەوریدا دەسووڕامەوە، لەنێو هاوێنەکانی دووربینەکە، بە مەزەندە جێی پۆلەکەی خۆمانم دیاری دەکرد، ئەوجا جێی (ڕەحلە)کەی خۆم... قوتابخانە پیرۆزترین جێی گوندەکەمان بوو، نەدەبوو بە سەریا باز بدەم، پاش ئەوەی هەندێک تێر دەبووم، ئەوجا وردەوردە بە ڕێز و نەوازشەوە سەرنجم لەسەر قوتابخانەکە دەگواستەوە، بەرەو پێدەشتەکە هەڵمدەدا یەکسەر لەسەر دوا لقوپۆپی (شێخ ڕەش)دا لەنگەری دەگرت، سەراپا سەرگوزشتە و یادی (شێخ ڕەش) خۆی دەهاویشتە نێو هاوێنەکانی

دووربینەکـەوە.

(لـە هەمـوو منـداڵان چاکتـر هەڵدەگۆڕامـە قـەد (شـێخ ڕەش)، دوا چڵـی ئاشـنام بـوون، هەرچـی هێلانـەی تیادابـوو، یەکەیەکـە دەمزانـی چ کات و ڕۆژێـک هێلکەکانی هەڵدێنێت... قەفـە ئەستورەکانی جێی گوریسـی جۆلانـەم بـوو... ئـای (شـێخ ڕەش)، تاقـە هاوڕێی بەسـۆزم... چەندیـن جـار خـۆم لـە ئاوایی و چاوانـی منـداڵان دەدزییـەوە، دەهاتمـە پەنـات!

هەڵدەگۆڕامـە سـەرت، بـە فرمێسـکم گەڵاکانـت تـەڕ دەبـوون... هـەر کـە بـەر تانـەی گـەوج و نەفامەکانـی دێ دەکەوتـم کـە پێیـان دەگوتـم: ئەمیـش هـەر یەکێکی وەک باوکـە بێڕەحمەکـەی لـێ دەردەچێت... هـەر وەک ئـەو گومـڕا و سـەرەڕۆ دەبێت، نەمدەزانی چ وەڵامێکیـان بدەمـەوە... پەنـام بـۆ دەهێنایـت، شێخ ڕەش! گوێت لێدەگرتـم، منیش بـە زمانی فرمێسـک دەردی دڵـی خۆمـم بـۆ هەڵدەڕشـتی... پاشـانیش هێمنییەکی خواوەندانـەت پێدەبەخشـیم... ئەوجـا یەکەیەکـە هێلانەکانـم بەسـەر دەکـردەوە... پاشـان دەهاتمـە خـوارێ... تـا دەگەیشـتمەوە نێو ئاوایی، دەیـان جـار بـەرەو لای تـۆ لام دەکردەوە، ئیـدی شـەوانیش خەونـم بـە گـەڵا و چـڵ و لـق و پۆپتـەوە دەبینـی، بـە زمانـی باڵندەکانـی سـەرت دەدوام(شـێخ ڕەش!).

ئەوجـا زیاتـر سـەرنجم هەڵدەدا، بناری چیـا دورەکـەی ئەوبـەر و چەنـد کوێـرە دێیەکـی خاپـوور و سـووتاو خۆیـان دەهاویشـتە نێـو چاوەکانـی دووربینەکـە... هەناسـەییەکی گەرمـی پێهەڵدەکێشـام و ڕقێکـی ئەسـتوور و پیـرۆزی پێدەبەخشـیم، بـە هەمـان ڕێـدا هاوێنـەی دووربینەکـەم دەخشـاند بەسـەر تەپۆڵکـەکان، جارێکـی دیـش شـێخ ڕەش و شـوێنەواری قوتابخانـە و تاقـە ماڵەکـەی بنـار، بـەرەو چیاکـە سـەر دەکەوتـم بـە نێـو گابـەرد و نمـا سـەختەکاندا هەڵدەزنـام، تـا دەگەیشـتمە بـەر ئەشـکەوتی ئەژدیهـا، سـەدان

وێنـەی جۆراوجـۆر تێکەڵـی هاوێنەکانـی دووربینەکـە دەبـوون...

ڕۆژێکیـان لەپڕ دەیـان سـەرباز و مودەرەعـە و سـەیارە خۆیان هاویشـتە نێو هاوێنەکانی دووربینەکـە... بـەوردی بـەرەو خـوار دەمڕوانی... وردەوردە هەمـوو قوتـە بەرزەکانی دەوری دێیـان گرت... سـەدان تۆپـە سیمی دڕکدار لەنێـو هاوێنەکانـی دووربینەکـەدا دەبریسـکانەوە... گرمەگرمێکـی سـەیر سـەری پـێ هەڵبڕیـم، هیـچ شـتێکم لـە ئاسـماندا نـەدی، دووربینـم لەسـەر چاوانـم لادا و بـە چـاوی ڕووتـەوە سـەرنجی بـەرەو خـوارم دا... سـێ - چوار هەلیکۆپتـەر، ئەوەندە نزم بوون، سنگیان نابووە سـەر قوتەکانـەوە... دووانـی دیـش لـە ئاسـمانی چیـا دورەکـەی ئەوبـەری دێ، بـە ئاسـتەم دیاربـوو... سـەرم هەڵبـڕی، دووانـی دیـش هـەر لەسـەر ترۆپکـی چیاکـەی ئێمـەدا بـە ئاسـتەم دیاربـوون... وەک ئـەوەی وەسـتابن، ئاوهـا دەکەوتنـە بەرچـاو... سـێ - چـوار هەلیکۆپتەرەکـە تۆزیـان لـە قوتـەکان هەڵسـاند - ئـای بـۆ دۆشـکا - یـەک، وردەوردە نیشـتنەوە...

مەغاویـرەکان دابەزیـن، زڕدایکەکـەم چەنـد جارێـک بـە دەنگـی بـەرز بانگی کردم... تـا گەیشتمە لای، هـەر دوو براکەشـم لەوێ بوون، بەترسـێکی سـەیرەوە لێی پرسـیم:

- ئـەو دەنگە دەنگە تەیارەن؟

- بەڵێ... هەلیکۆپتەرن.

- زۆرن؟

- چواریان لە خوارێدان و دووانیشیان بەسـەر ئێمەوەن.

زڕدایکم وای زانـی گاڵتـەی لەگەڵدا دەکـەم... هـەر کە دەسـتم بۆ ئاسـمان

برد و نیشانم دان، گوتی:

- ئەیەڕۆ، چی بکەین خوایە، قوڕی کوێ بکەم بە سەرما. خۆ باوکیشتان لێرە نییە...

زۆرم پێ ناخۆش بوو، چۆن ئەمڕۆ باوکم ڕۆیشتووە و بە منی نەگوتووە مستەفا، گەورەی ماڵی، ئاگات لێبێت.

- بۆ کوێ چووە؟

- جا کێ سەر لە بەزم و ڕەزمی ئەو دەردەکات... ئێواری یا سبەی دێتەوە، هەر هەمان قەوان دووبارە دەکاتەوە، بووینە بیست: سی... چل... ئەوە خۆ ساز دەدەین... چەکمان زۆرە... هەر ئەم قسانە دەکات و هیچی تر!

زڕدایکەکەم گوتی:

- خۆتان مات بکەن... بە هیچ لایەکا مەچن.

من گوتم:

- پێم وایە لە دەوروبەری دێیەکەماندا ڕەبایە دروست دەکەن.

زڕ دایکەکەم بەتوڕەییەوە گوتی:

- خوای دەکرد خاکی دێیان بە تورەگە دەبێژا... خوای دەکرد جارێکی دی بست بە بستیان دەسووتاند.

بۆ ئێوارە باوکم پەیدا بووەوە، پێش ئەوەی ئێمە چ قسەیێک بکەین، ئەو یەکسەر گوتی:

- قوتە بەرزەکانی دەوری دێیان کردە ڕەبایە، هەر لە نزیکی جادە قیرەکەیش، پێدەشتەکەیان کردە مەقەڕی فەوج... زەحمەتە ئەوجا ئێمە لێرە ئیدارە بکەین... بە دووربین دەمانبینن، چاک وایە خۆ دەرنەخەین، بەوردی بە بەینی بەردەکاندا هات و چۆ بکەین... تا سبەی... بەڵکوو...

قسەکەی تەواو نەکرد زڕدایکەکەم گوتی:

- دەی بزانین ئەمجارە بۆ کوێمان دەبەیت...

- بێخەم بە، سبەی... ئا... سبەی...

ڕۆژی دوایی، ئێوارە وەختێکی درەنگ، باوکم لەگەڵ دوو هێسترسواری دیدا خۆیان گەیاندە نزیکی ئەشکەوتەکە، هەر هەموومان بەرەوپیرییان چووین... سەبارەت بەوەی چەند مانگێک بوو جگە لە یەکدی کەسمان نەبینیبوو، زۆرمان پێ خۆش بوو، وا باوکم دوو کەسی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو... دوو گەنج، ڕەشتاڵەی باریک، سەر و ڕیش هاتوو، هەریەکە هەشت نۆ مەخزەنی کلاشینکۆف و دوو ڕومانە و دەمانچە و حەربە و مەتاری ئاو و دووربینیان پێ بوو... هەر کە گەیشتنە لای ئێمە، جێیان بۆ ڕاخرا و یەکسەر پاڵیان دایەوە، پاش حەسانەوە و نانخواردن، باوکم پێی گوتین:

- کوڕینە گوێ بگرن، ئەمانە ئەو کەڵە پیاوانەن، نە تەسلیم بە عێراق بوون، نە ڕێی ئاوارەییان گرتە بەر و پەناهەندەیی هەڵبژێرن... ئەوا سبەی زوو، پێش خۆرهەڵاتن، هەر چییەکمان هەیە باری دەکەین... دوو هێستر و ولاغەکەی خۆمان زۆریشن... حاڵی بوون؟ زۆر زوو لە خەو هەڵسن...

هەموومان بێدەنگ بووین... باوکم بێدەنگییەکەی شکاندین.

– ئەمانە و هاوڕێکانیان چەند مانگێکە لە چیادان... شەوانیش ڕوو لە هەندێک دێی (نەسووتاو) دەکەن، نان و پێخۆر وەردەگرن، هەر بە شەویش دەکشێنەوە... کوڕینە، ئەمانە هەوێنی پیاوەتی ئێمەن... ئەمانە ئەو کوردانەن، کە دەیانەوێت چۆن بە کوردی لەدایک بوون، ئاوهاش بە کوردی بمرن... گەلێک شوکر، میللەت ئەم شێرانەی ماوە.

ئیدی باوکم گەلێکی بە سەر و باڵای پێشمەرگەکاندا هەڵدا... گەلێک قسەیشی هەر لە ڕووی سۆز و خۆشەویستییەوە بوو... بە ڕای باوکم، لەوکاتەدا هەر پێشمەرگە هەبێت و ئیتر گرنگ نییە! هەموو شتێک ئاسان دەبێت...

باوکم گەلێکی گوت و کەمتر بواری قسەکردنی بە میوانەکان دا... تەنانەت ڕێی ئەوەشی نەدان، باسی ماندوویەتی و کەنەفتی خۆیان بکەن... زوو قسەی لە دەمی یەکێکیان قۆزتەوە...

– ئەی چۆن، گەر ماندوو نەبین... گەر شەو نەدەینە دەمی ڕۆژەوە، چۆن میللەت ڕزگاری دەبێت و کورد بۆ خۆی شتێک بە شتێک دەکات... چەند ملیۆن کەسێک چاویان لە ئێمەیە... گەر ئێمە نەبین، ئەدی کێ شتێک بکات... چ باوەڕ ناکەم بێگانە کارێکمان بۆ بکات، دەبێت هەر خۆمان پشت ئەستوور بین بە خۆمان...

دیار بوو یەکێک لەو دوو پێشمەرگەیە حەوسەڵەی گوێگرتنی نەما، ناچار بوو بەزۆر قسەکان بە باوکم ببڕێت.

– حاجی، ماندووبوون ئەوەندە گرنگ نییە... هەرگیزیش گرنگ نییە زۆر بین یا کەم، ئەوەی کە زۆر گرنگە ئەوەیە، دەبێت پێشەکی بزانین چ دەکەین، بۆ کێی دەکەین، چ چینێک لەم کارەی ئێمە سوود وەردەگرێت،

دەبێ بزانین بە چ فکر و بۆچوونێکەوە ئەمە دەکەین و ڕوو لە چ لەنگەرێ دەکەین...

دەبێت ئەمجارەیان شۆڕشەکەمان وەک جاری پێشوو بێسەروبەر و عەشایربازی و بێ تەنزیم نەبێت، هەر ئەوە نەبێت مل پێوە بنێن و تەوەکەل بە خوا... سەر ئەنجامیش مامەڵەمان پێوە بکەن...

باوکم بە جۆرێک ڕەنگی تێکچوو، پێم وابوو گەر میوان نەبان، دەریدەکردن، چونکە ئەو هەرگیز دژە عەشایەریەت نەبوو، بەڵکوو هەموو کارێکی چاکی بەکاری عەشایەری لە قەڵەم دەدا... عەشیرەت بەلای باوکمەوە دەیکردە شیرازەی یەکبوون و پیاوەتی، دیاریش بوو بە چاکی لە قسەکانی ئەو پێشمەرگەیە حاڵی نەببوو، بۆیە وەک فیشەکە شێتە بە ڕوویا تەقیەوە:

- بۆ ئێمە منداڵین؟ چۆن نازانین چ دەکەین؟ ئەوەی دەیکەین بۆ قازانجی کوردە... داگیرکەر دەکوژین، دەیانکوژین و دەیانکوژین... ئیدی بۆ نازانین چ دەکەین؟ بۆ پێت وایە حەزمان لەم شاخ و دەربەدەری و دەشتەیە؟ یا دەبێت کوڕی میللەت بین و بۆ کورد فیداکار بین... دەبا هەر شتێکی بۆ کورد نەبێت، ئەمن بە پولێکی قەڵبی ناکڕم...

پێشمەرگەکە هەستی بەوە کرد، قسەکردن لەگەڵ باوکمدا زمانی تایبەتی دەوێت و ئەویش ئەو زمانە نازانێت، بۆیە بێدەنگی هەڵبژارد و خەوتن.

هەر لەگەڵ تاریک و ڕووندا سێ وڵاغ بار کرا و ئێمەیش بە پێ وەدوویان کەوتین.

***

پێشمەرگە پەرەی سەند، دەبووە بیست... سەد... دوو سەد... هەزار، هەریەکە هیواو ئاواتی میللەتی لە ئەستۆ گرتبوو، ڕقێکی موقەدەس چاوانیانی دەدرەوشاندەوە، گەلێک جار ئەو ڕقە دەبووە باروووت و پاڵی بە گوللەوە دەنا، تەوێڵ و سنگی داگیرکەری دەسمی... ڕێکخراوە سیاسییەکان، ئەودەمە وەخۆ کەوتن، پێشمەرگەکانیان ڕێکخست، باوەڕی بەتین تێکەڵ بە هێزی پێشمەرگەکان بوو.

دێیە سووتاوەکەی ئێمە زیاتر ڕەبایەی وەخۆ دەگرت، داگیرکەریش وەک سەگی هار پەلاماری خەڵکی دەدات... ئەو پێشمەرگانەی لە ئاشبەتاڵەکەدا تەسلیم ببوونەوە، بەشێکیانی کرێ و بەشێکی دیشی بەرەو خوارووی عێراق نارد و تووشی هەزار پەتپەتێ کران.

باوکم بە پێی تەمەن و شارەزاییەکەی لە یەکەم مەفرەزەکاندا - بۆ شەڕ و کەمین - بە یارمەتی پێشمەرگەکان - کونجێکیان بۆ دروست کردین... باوکم هەرجارە یەکێک لە ئێمەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، دوویشمان لە ماڵێدا دەماینەوە، تا ئەو یەکە لە مەفرەزە و جەولە دەگەڕایەوە، هەموو لەسەر پشکۆی چاوەڕوانیدا دەژیاین، هەر جارێک منی لەگەڵ خۆیدا بردبا، لە لایێکەوە گەلێکم پێخۆش دەبوو، هەستم دەکرد ئیدی پیاوێکی تەواوم و بۆم هەیە لەنێو پیاواندا دابنیشم و قسان بکەم... لە لایێکی دییەوە پێم ناخۆش بوو، چونکە بۆ شەڕی نەدەبردم... نەک من، بەڵکوو لە نۆرەی هەریەک لە براکانمدا، کەسمانی بۆ شەڕ نەدەبرد، دەیگوت:

- پەلەتان نەبێت، شۆڕشەکە درێژخایەنە... لە خۆڕا بێ مامۆستا فێرە شەڕ دەبن... مەبەستی من ئەوەیە (ئێوە ئێستا) ڕابێنەوە لەسەر برسییەتی و شەو و ڕێی سەخت و ماندووبوون...

ئێمەی سێ برا چ خۆشییەک هەندەی ئەوەمان لا خۆش نەبوو، کە

دەگەڕاینـەوە و باسـی پێشـمەرگە و جەولـە و تاریکەشـەومان بـۆ یەکـدی دەکـرد... بـە زمـان و عەقڵ و فامـی یەکـدی دەدوایـن...

سـاڵ و نیوێکمـان بـەم شـێوەیە گوزەرانـد... ئیـدی بـە هیـچ جۆرێـک ڕازی نەدەبوویـن باوکمـان ڕێـی شـەڕکردنمان لـێ بگرێـت... ئەگەرچـی نەماندەوێرا لـە ڕوویـدا بووەسـتین، بـەڵام هـەر کـە ئـەوان، بـۆ کەمیـن و شـەڕ وەڕێ دەکەوتن، بەدزییـەوە بـە دوویـان دەکەوتین، کـە لێیـان ئاشـکرا دەبوویـن، ئیـدی قسـەیان نەدەکـرد... ئـەو سـەردەمە - ئەگەرچـی - ژیـان و گـوزەران سـەخت بـوو، بـەڵام تـام و چێژێکـی تایبەتـی هەبـوو... دە - دوانزە هەلیکۆپتـەر بـۆ دوو - سێ پێشـمەرگە هەڵدەسـتان... ئـەو دێهاتانـەی نزیکـی هەندێـک شـار و شـارۆچکە بـوون، جێـی حەسـانەوەیان نەمابـوو... زۆربـەی (موختـارەکان) نـەک جاسـووس بـوون، بەڵکـوو لـە جاسووسـە جەللادەکان خراپتر بوون... لەگـەڵ هەمـوو ئەمانەشـدا، هەسـتمان نەدەکرد لـەم جیهانـەدا کەسـێک هەبێـت وەک ئێمـە سـەربەسـت بێـت و خـۆی خاوەنـی خـۆی بێـت...

لـەو ماوەیـەدا نەمزانـی چـۆن وا زوو نـاوی باوکـم لـە حاجـی محێدیـن - ەوە بـوو بـە( حاجـی موختـار کـوژ) باوکیشـم ئـەم نازنـاوەی پـێ ناخـۆش بـوو، بەڵکـوو هەندێکیشـی پـێ خـۆش بـوو... لـەو سـەردەمە، موختـاری زۆربـەی دێهاتەکانـی پێدەشـت و هەندێـک دێـی شـاخاوی - کـە بـەر لـە ئاشـبەتاڵ زۆربەیـان مەشـئولی دێ بـوون - ببـوون بـە جاسـووس، هـەر پێشـمەرگەیێک ڕووی لـە دێیەکـی ئـەو نـاوە کردبـا، پـاش چەنـد سـەعاتێک، چەنـد هەلیکۆپتەرێـک ئێنزالیـان دەکـرد و دەوری دێیـان دەگـرت، بـۆ پێشـمەرگەکان دەچـوون... مخابـن، گەلێـک پێشـمەرگەی جوامێـری بـە هـۆی جاسووسـی ئـەو موختارانـەوە شـەهید بـوون... باوکـم وازی لـە هەمـوو چالاکییـەک هێنابـوو و جـاری وا هەبـوو دوو شـەو وەڕێ دەکـەوت و لـە

نیوەشەوێکدا موختاری دێیەکی دەهێنا... نەیدەبردە چ لایەک... دەیگوت:

- تاقەتی ئەوەم نییە تووشی دەمەقاڵێ ببم... من و چەند کەسێک ڕۆحی خۆمان دەنێینە سەر لەپی دەست و موختاری دەهێنین... ئەوجاش بە واستە و واستەکاری، یا بە ترەکەفالەتێک بەری بدەن... من تاقەتی ئەمەم نییە و خۆم حوکمی کوردستانی بەسەردا دەدەم...

نەیدەبردە لای چ مەسئولێک، بە هەر جۆر با، گەر دەوریشی گیرابا، بە شەو دەیبردە نزیکی دێیەکەمان، لەسەر شێخ ڕەشدا، پشتوێنی موختارەکەی دەکردە گوریس و ئیعدامی دەکرد...

جارێکیان پێنج کەس بووین، دوو شەوی ڕێک بە پێدەشت و هەردەکاندا تا بەرەبەیان ڕێمان دەکرد... نیوەشەوێک دەوری ئاواییکمان گرت، موختارەکەی - باوکم وەتەنی، بێناموسترین موختار و جاسووسی دنیا بوو، ڕقی لە هەرکەسێک با، لەلای میری بوختانێکی بۆ دروست دەکرد، چەندین کەسی بە تەفرە دابوو، وێرای ئەوەی ئیخباری پێشمەرگەی دەکرد، بۆ پیاوانی میری، گەوادیشی دەکرد... باوکم لە سەرەتادا سێ پێشمەرگەی لە دەوری ئاواییدا دانا، پاشان منی لە نزیکی دەرگای ماڵەکەی موختار ڕاگرت، نەمزانی چ شتێکی پێ بوو، هەر سەگێک بوەڕیبا و بۆی هاتبا، شتێکی دەدایێ، سەگەکەی دەخستە کلکەلەقێ... هەر نەمزانی چۆن موختاری بە باڵبەستراوی هێنایە دەر و چ شتێکی لە دەم ئاخنی بوو... هەر ئەو شەوە دوور کەوتینەوە، بە ڕۆژ لەبن تاوێر و هەردەکاندا خۆمان مات دەدا، شەویش وەڕێ دەکەوتین، پاش دوو شەوی دی، لە نزیکی دێیەکەمان ئێمەی ڕاگرت، خۆی بە لایەکدا ڕۆشت، سەعاتەوەختێکی پێ چوو... پاشان سێ پێشمەرگەی لەملا و ئەولادا دامەزراند... باوکم موختاری بە دەمبەستراوی بەرەو

شـێخ ڕەش بـرد و پێـی گـوت:

- گـوێ لـە حوکمـی کوردسـتان بگـرە، خایەنـی بێئابـڕوو دەبێـت ئـەم موختـارە بـەرەو جەهەنـەم بنێردرێت(ئەمـە حوکمـی کوردسـتانە و ئـەوا منیـش بـۆ کـورد و کوردسـتان ئـەم حوکمـە جێبەجـێ دەکـەم).

ئیدی تا ماوەییکی دی و ئیعدامکردنی موختارێکی دی، باوکم هەند کەیف خـۆش دەبـوو، نەبێتـەوە، کەیفخۆشییەکەشـی بـە ئیعدامکردنـی موختارێکـی دی دەمـەزەرد دەکـردەوە... گەلێک جاریـش هەندێـک پێشـمەرگەی قۆشـمە، لەمـلا و ئـەولاوە موختارێکیـان بـە دیـاری بـۆ باوکـم دەهێنـا... ئەگەرچـی دڵخۆش دەبوو، بـەڵام وەک ئـەوە نەبـوو خـۆی هێنابێتـی، دەیگـوت:

- هەر چاکە... بەڵام حەیفێ، خۆم نەمهێناوە...

(شـێخ ڕەش ئەوەنـدە موختـاری بـە سـەرەوە هەڵواسـرابوو، ئیـدی حوکمەت جارجارە کەمینی لە دەور دادەنا... هەموو پێشـمەرگەکان سـەریان لـەوە سـووڕ دەمـا، بـۆ تـا ئێسـتا حوکمـەت شـێخ ڕەشـی نەبڕیوەتـەوە... نەیسـووتاندووە... تێزابـی بەسـەردا نەکـردووە؟

کە منداڵ بووم، لە پیاوە بەتەمەنەکانی دێیەکەمانم بیستبوو:

شێخ ڕەش:

سـەد و چەنـد سـاڵێک لەوەوبـەر بـە بیـرەوەری باپیرانـی پیرانـی دێ... گەنجێکی ڕەشتاڵەی کەڵەگەت، بە تەلیسـێکی پڕ لـە خاک، لە عەرەبستانەوە دەکەوێتـە ڕێ، بـە پـرس و سـۆراغ بـە چەنـد مانگێک دەگاتـە دێیەکەمـان... هەمـوو خەڵکی ئاوایـی لـێ کـۆ دەبنـەوە... تەلیسـەکەی کۆڵـی پـڕی دەبێـت لـە وردە تورەگـە، بـە هیـچ جۆرێـک ناهێڵێـت ج کەسـێک دەسـتیان بداتـێ...

بە ناونیشـان هەڵدان، پیرەمێردانی ئەوسـای دێ دەیناسـنەوە، کە کوڕەزای شێخ بهائەدین - ە، ئەو شێخ بەهائەدینەی کە لەگەڵ چەند کەڵەپیاوێکی دێدا بناغـەی ئـەم دێیـە دادەمەزرێنـن و دێ ئـاوەدان دەکەنـەوە... ئەوجـا شـێخ بەهائەدیـن، خـۆی و ژنەکـەی وەڕێ دەکـەون، بـە پـێ ڕێـی حـەج دەگرنە بەر... ساڵ دێت و ساڵ تێدەپەڕێت، شێخ بەهائەدین ناگەڕێتەوە، خەڵکی زۆر بەپەرۆشـیەوە دەبـن... تمـەس نەخـۆش دەکەوێت و ناتوانێت بگەڕێتـەوە... ئیدی چ هەواڵێکی نازانن... شێخ بەهائەدیـن لـەو عەرەبستانە دەمێنێت، منداڵیـان دەبێت و گـەورە دەبن و چەندین وەچەیـان لێدەبێتـەوە... وەسـیەت دەکات.

(تۆوی ڕەسـەن دەبێت لەسـەر ئەرز و خاکی خۆیدا بنێژرێن...

هەروەهـا وەسـیەتی ئەوەشـی کردبوو، هەمـوو کەسێکی خانەوادەکەی، گـەر مـردن، بـە ئەمانـەت بنێژرێـن، تـا ئـەو قارەمانەیـان تیـا هەڵدەکەوێت، کـە خاکـی جەسـتەیان بـەرەو زایـگای یەکـەم تـۆو دەبـات... شـێخ ڕەش، کە نـاوی صـلاح الدین دەبێت، ئـەو وەسـیەتە لـە بـاب و باپیری خۆیـەوە، وەک ئەڵقە لـە گوێ دەگرێت... پاش ئەوەی ناونیشـانی باپیری هەڵدەدات، دەیناسـنەوە، ڕێزێکی مەزنـی لـێ دەگرن... یەکـەم کاری صـلاح الدین، هـەر لـە هەمـان شـوێنی (ئـەو داربـەڕووەی ئێسـتا کـە نـاوی شـێخ ڕەشـە - ئـەو سـەردەمە نەمامێکـی چکۆلـەی سـەربەرز دەبێـت - گـۆڕسـتانێک ئـاوەدان دەکاتـەوە، هـەر تورەگەیێـک و لـە قەبرێـک دەنێـت:

ئەوجا بە کوردییێکی ڕەوان تەڵقینێکی ورەبەخشیان دەداتێ:

(سـڵاوی خۆشەویستی بۆ ئێوەی خۆشەویست... ئارام بن و خۆش بە حاڵتـان، گەڕانـەوە نێو باپیران و کەسـوکار... لـە خـاک بـوون و بوونـەوە بـە خـاک، بۆ ئێمەیش بـوون بـە وەتـەن...

سوێند بە گیانی ئێوە... تا ماوین بتپارێزین... کە مردین، ببینە چەند گەردێکی بێگەرد، لە پاڵ ئێوەدا ببینە نیشتمانی مەزن، تا دوارۆژ، منداڵان دەم بە خەندە، چاوی سەرفرازییان بە گەرد و خاکی ئێمە بڕێژن...

کە صلاح الدین دەمرێت، نەمامی داربەڕووەکە لە هەڕەتی لاوییەتیدا دەبێت... سێبەرەکەی دەبێتە ئارامگەی هەمیشەیی، ئیدی ناوی دەبێتە (شێخ ڕەش) و گەورەترین سوێند...

(سوێند بە شێخ ڕەش)، ڕاست و درۆی لە یەکدی جیا دەکردەوە...

(بۆخاتری شێخ ڕەش)، گەورەترین تورەبوونی دادەمرکاندەوە.

(نەزری شێخ ڕەش)، قورسترین کاریانی لا سووک دەکردەوە...

ئیدی لەو سەردەمەوە تا دنیا دنیایە، شێخ ڕەش هەر بەرەو ناخ ڕەگی دادەکوتێت... چ هێزێک نییە بنبڕی بکات... تێزابی بەسەردا بکەن و بیسووتێنن، بیبڕنەوە، لق و پۆپی دیشی لێدەبێتەوە... پیرانی ئاوایی دەڵێن (شێخ ڕەش) بە شەو، مانگ و ئەستێرەکان چاویان لێیە و دەیپارێزن، بە ڕۆژیش هەتاو دەیپارێزێت...

دەڵێن کاتێک شێخ ڕەش لە عەرەبستانەوە بەرەو کوردستان بەڕێ دەکەوێت، عەسای پۆڵا لە دەست، پێڵاوی ئاسن لە پێ، کەشکۆڵی (حیکمەت) لە شان، فەرسەخ بە فەرسەخ ڕێ دەبڕێت، لە هەر گوندێک... شارێک... دێیێک، لایدابا، بە وەسیەتنامەی باپیری بەری کانیاوی داگیرکراو. *

کچی ڕفێنراو و بەندی نێو قەڵای تەلیسماوی، پاڵەوان و کەڵەمێردان، کە بە تاڵە مووی سەری دیوی سپی کوترابوون...

سیحری پیری ژیانی فەرهاد کوژ، هەموو بە وەسیەتنامەکەی باپیری شێخ ڕەش، کانی بۆ هەژارانی دێ... کچی ڕفێندراو بۆ شوان - ی ئەویندراری خۆی.

پاڵەوانان بۆ مەیدانی گیانبازی... سیحریش بۆ زبڵدان دەگەڕانەوە...

دەڵێن: تا شێخ ڕەش گەیشتە دێیەکەمان. سەدان دێ... چەندین زمان... پەیڕەوی وەسیەتنامەی باپیری شێخ ڕەشیان کردووە... (تا ئێستایش) ڕەگی سەربەرزییان بەرەو ناخ دادەکشێت و تا دنیا دنیایە لەسەر زەوی خۆیان ڕەگی بەهێزتر دادەکوتن...

حاجی موختار کوڕی باوکم، وردەوردە فێرە قسەی زل زل بوو، دیسانەوە بە ئارەزووی خۆی سەروپۆتەڵاکی قسەکانی دەشکاند، ئەوجا بە نێوی گەورەپیاوانەوە قسەی دەکرد... بە شێوەیێک دەیدایە دەم یەکەوە، لەگەڵ ڕەفتارەکانی خۆیدا بگونجابا... گەر کارێکی ناڕەوای لە پێشمەرگەکان دیبا، یەکسەر بە تووڕەبوونەوە دیگوت:

- ئێمە سۆسیالیستین... وەکوو ئەوانەی پێشوو نین، هەریەکە بۆ خۆی بێت... نابێت، شتی وا نابێت... نا...

هەندێک پێشمەرگەی قۆشمە لێی کۆدەبوونەوە و لێیان دەپرسی:

- ئەرێ حاجی، مارکس دەربارەی موختار چ دەڵێت؟

- ها... ئێژێت موختاری جاسووس کوشتن وە حەجێکە!

- ئەی حاجی، لیلین بۆ ئەم قۆناغەی ئێمە چی گوتووە؟

- لیلین ئێژێ لە قۆناغی سۆنسیالیسا، ئەگەر زانیتان کوردێک بەئاستەم خایەنە و نەیکوژن، ئەوا ئێوەیش خایەنن.

باوکم پێی وابوو مارکس و لینین، ئەگەرچی لە وڵاتی ئێمەدا نەبوون، کوردیش نەبوون، بەڵام کوردیان هەر ناسیوە:

- ئەی چۆن (فەرمەسۆنن) کوردیان نەزانیوە... حەی، ئێوە منداڵن و نایانناسن، بەچاکی لە کتێبەکانیان ورد نەبوونەتەوە!

گەر یەکێک لە پێشمەرگەکان هەندێک سەرچڵی کردبا، باوکم یەکسەر ئیمتحانی دەکرد:

- دەی دەمڕووت! دە بزانم دەزانی لیلین لە چ کتێبێکدا گوتویەتی (هەر کوردێک داگیرکەر نەکوژێت، خوا دەرگای بەهەشتی لێناکاتەوە؟)

ئەگەر پێشمەرگەکە بزە دایگرتبا، باوکم یەکسەر پێی دەگوت:

- ها، دەمڕووت، ناڵێم نایزانی... دە بڵێ دەی... دە با فێرت بکەم، ئەوە لە کتێبی (چۆن کوردستان ڕزگار دەبێت)، دە بڕۆ هەڵسە بیخوێنەوە و بەجوانیش لێی وردبەوە.

ئەگەر پێشمەرگەکە لە جنێو نەترسابا و بەباوکمی گوتبا:

- قوربان، ئەو قسەی فەرمووت لەو کتێبەدا نییە، هی لینینیش نییە، بەڵکوو قسەی مارکسە و لە کتێبی خورشید و خاوەر - دا گوتویەتی.

پاش یەک - دوو جنێوی مزر، ئەوجا باوکم دەیگوت:

- قوڕ بەسەر عەقڵت، مانکس چ ئیشێکی نەبووە، هەر باسی عەشقبازی بکات! گەر ئێستا لێرەدابا و گوێی لەم قسەی تۆ با، ئەوا ڕیش و سمێڵەکەی دەتاشی.

- حاجی، دەبوو بە پێشمەرگە؟

- فلتەفلت.

گەر لەمە زیاتر لەسەری ڕۆیشتبان و تووڕەتریان کردبا ئەوا دەیگوت:

- من لیلین و میلین نازانم... من داوای حورییەت دەکەم، ئەو کەسە ترسنۆکانە دەکوژم، کە دێن بمکوژن و خاکم داگیر بکەن و ناوێرن داوای حورییەت بۆ خۆیان بکەن... ئەگەر پێیان گوتبا، مام حاجی، ئەم قسە ڕێک لە قسەی گەورەپیاوێک دەچێت، حاجی تووڕە دەبوو و دەیگوت:

- نەخێر، ئەوە قسەی مامی خۆتانە!

***

حەمە ڕەزا شا بەجۆرێک سەر سنووری گرتبوو، کەم کەس دەیتوانی بەسەلامەتی بپەڕێتەوە بۆ (ئەودیو) چەند قارەمانێکی بە باڵبەستراوی تەسلیم بە عێراق کرد. عێراقیش بێ سێ و دوو، ئیعدامی دەکردن، هەر کە باوکم گوێی لێبا حکومەت کوردانی ئیعدام کردووە، ئاگری تێ بەر دەبوو، دەیویست گەرماوگەرم تۆڵەیان بکاتەوە، جا قوڕ بە سەر ئەو عەسکەر و جاشە، یا ئەو ئەمن و ئیستخباراتەی لەو ڕۆژەدا بەردەستی باوکم دەکەوتن، خۆی وەتەنی:

- دوو جاران گیانیان دەکێشم... دەیانکوژم لەسەر ئەوەی دوژمنن، دووهەمیش لە تۆڵەی کەڵەپیاوان بە ئاگری جەهەنمی ئەم دنیایەیان دەسپێرم... دەیانسووتێنم... خۆڵەمێشەکەشیان دەسووتێنمەوە... ئەی چۆن؟

دیاربوو حکومەتی عێراقی نیشتمانی و شا ئاریامیهری ئێرانی، بڕیاری ئەوەیان دابوو بە هەر دوو لا لەناومان ببەن، شا سەر سنووری بە ئەرتەش تەنی، عێراقیش بە چەند هەزار عەسکەر و جاش بە پاڵپشتی تۆپ و تەیارە و تانک، هێرشیان بۆ هێنایین... زستانەڕۆژێکی سەخت بوو،

تەنها مەحمودی برام لە ماڵێدا بوو. من و ئەحمەدی برام لەگەڵ باوکمدا بووین، هەر کە پێشمەرگەکانی کەمین هەواڵیان داینێ، کە هێرش دەبێت، ئێمە زۆر زوو وەخۆ کەوتین، فریای ئەوەش کەوتین کۆنە سەنگەرەکان پاک بکەینەوە و چاکتر مەحکەمیان بکەین، گەلێک جار باوکم بەتەوسەوە سەرنجی ئەو پێشمەرگانەی دەدا، کە بەبێ سەنگەر و بە پێوە شەڕیان دەکرد، هەرگیز بە ئازا، تەنانەت بە دڵسۆزیشی نەدەزانین، گەلێک جار دەیگوت:

- پیاوی ئازا ئەو کەسەیە دەستی چاکتر دەوەشێنێت، چاکتریش خۆی دەپارێزێت و کەمتر تەقە دەکات... بەڵام گەر تاک تاک و بەیناوبەین، کەوکوژی بۆیان دانیشتیت، ئەوا نێریان تیا نییە سەر بەرز بکاتەوە... نێریش نییە بتوانێت سەنگەرت پێ چۆڵ بکات...

هەموو جارێک بە هەموو پێشمەرگەیەکی دەگوت:

- قوربانت بم، خۆت چاک قایم بکە و دەستیش بە فیشەکەوە بگرە... گوێ لە مامی خۆت بگرە، من چاکتری دەزانم... لیلین و مانکس لەم رووەوە هەرچییەکیان گوتبێ، ئەوا مامی خۆت چاکتری دەزانێت... ئەوان هەر تەقەیان نەکردووە.

پێشمەرگەکانیش بە پێکەنینەوە پێیان دەگوت:

- حاجی، چوزانیت ئەوان تەقەیان نەکردووە؟

- حەی، خۆ ناشێت بێژن قائیدی عەسکەری بوون.

- ئەوەشیان زانیوە.

بە جۆرە کەیلییێکی تەوسئامێزەوە وەڵامی دەدانەوە.

- نەعەوزوبیلا، بێژن خوا و پێغەمبەر بوون.

- نە بەو جۆرەیش.

ئەی چی، پیاو ناوێرێت دەست بۆ سمێڵی ببات، لێی ڕادەپەڕن: لیلین وای فەرمووە، مانکس وای فەرمووە... کوڕە بابە ئەوەی ئیشی منە من، خۆم دەیزانم، من گرەو دەکەم ئەگەر ئەوان بتوانن ئا لێرەدا و لەم شوێنەی ئێمەدا لە ئێمە باشتر، شتێک بکەن، هەی بەرخوردار بن، خۆ ئێمە نەعوزوبیلا ڕۆح ناخەینە بەری کەس، ئێمە (ئێستا) ڕۆح دەکێشین.

گۆلمەزی باوکم کات و شوێنی بۆ نەبوو... تا لەگەڵ ئەحمەدی برامدا چوونە نێو سەنگەرێکەوە، هەر بۆڵەی بوو، من و پێشمەرگەیێکی دیش، بەرەو سەنگەرێکی دی چووین، گەلێک دوور بوو لە سەنگەرەکەی باوکمەوە، ژمارەی هەموو پێشمەرگەکان چل و سێ کەس بووین، گەر بە قسەی باوکمیان کردبا، سەرئەنجام وا نەدەکەوتەوە...

باوکم دەیگوت:

- کوڕینە، ئێمە زۆرین، چل و سێ کەس زۆر زۆرە، قوتە بەرزەکان تەحەمولی ئەم هەموو پێشمەرگەیە ناکەن... ناشبێت هەر هەموو بە جارێک بەشداری شەڕ بکەن... دەبێت بیست کەسێک شەڕ بکات و ئەوانی دیش ڕێی کشانەوە تەئمین بکەن و ئامادە بن بمانگۆڕن، با هەر هەموو شەڕ نەکەن... خەمتان نەبێت نۆرە دەگاتە سەر هەرهەموومان، با خەسارەت کەمتربێت و پێشمەرگەکان ژمارەیان کەمتر نەبێت... شەڕ بە ژمارە نییە... یەک پێشمەرگەی شەڕکەر، زۆری پێ دەکرێت...

کەچی بەوەی کە گوایە بە ژمارەی ئەوانەی هێرش دەهێنن زۆر زۆرن و چەند هەزارێک دەبن، دەبێت هەر هیچ نەبێت بۆ یەک - دوو

ڕۆژێک بەرگری بکەین و ئەوجا بکشێینەوە... ئەمەیش پاش ئاشبەتاڵ دەبێتە یەکەم شەڕێک، کە میری بەم هێزە زەبەلاحەوە هێرش بێنێت، تا کوشتاری زیادی لێ بکرێت، ئەوا ئەستووری هێزی پێشمەرگە و پتەوی باوەڕیان دەردەکەوێت... باوکم چ گوێی بەم قسەیە نەدا... پێیان گوت:

- بڕیار بڕیاری چی... ئەمە شەڕە و مردنی تیایە، ئازایەتی و عەقڵی دەوێت... چ کەسێک بە بڕیار ئازا نابێت و بە بڕیاریش فێرە عەقڵی شەڕ نابێت... ئەو قوتەیەی من بۆی دەچم، هەر تەحەمولی دوو کەس دەکات... هەر خۆم و ئەحمەدی کوڕم بۆی دەچین... قایل نیم چ کەسێک بێتە ئەوێ... تاقەتی نوزەنوزی بریندارم نییە... ژمارەی کەم، خەسارەی کەم... بڕیاری خۆتان بۆ خۆتان.

دیار بوو نەیاندەویست بە هیچ جۆرێک دڵی باوکم عاجز بکەن، دەیانزانی ئەگەر باوکم هەر هیچ شتێک بەچاکی و دروستی نەزانێت، ئەوا لە مەسەلەی شەڕ و هونەرەکانی شەڕدا کەم هاوتایە... باوکم بەتەوسەوە ڕووی لە یەکێک لە مەسئولەکان کرد و پێی گوت:

- ئەی کوا بڕیاری گەورە... مەبەستم بڕیاری ئەوەتان داوە پێشمەرگەکان پشت و پەنایان هەبێت؟

- دەبێت چ بڕیارێک بێت؟

- تەواومان کرد... کوا نان؟

هەرهەموو بە سەرسووڕمانەوە سەیری یەکدییان دەکرد، ئەوجا باوکم وەک ئەوەی کە شارەزایێکی تەواوی شەڕە، نەڕاندییە سەریان:

- دەی کوڕینە، وەخۆ کەون... لە شەڕدا پێشمەرگە وەکوو تفەنگە،

تفەنگی بێ فیشەک، وەک پێشمەرگەی بێ نان و ئاوە... ئێستا زستانە و ساردە... بەڵام هەرهەمووتان مەتارەکانتان پڕ بکەن...

باوکم لەگەڵ ئەحمەدی برام کەوتنە ڕێ، بە خۆی و پیرە برنەوە درێژەکەی، ئەحمەدیش بە کلاشینکۆڤ و هەندێک ڕومانەوە سەر کەوتن...

هەر لەگەڵ گەردی بەیانیدا گورەگوڕی تەیارە ئاسمانی گرتەوە، کوێرانە ساروخ و بۆمبایان دەهاویشت... خۆیان خاڵی کرد و گەڕانەوە، ئەوجا تۆپباران دەستی پێکرد، هەند بە خەستی ئەو ناوەیان دادەبێژا، دەتگوت بە سەڵییە تۆپ دەتەقێت، لە پێشدا لە ناوقەد، ئەوجا ترۆپکەکان، چرەدووکەڵێکی ڕەش و تەپوتۆزێکی خەست بەری ئاسمانی گرت، جەیش و جاشیش لە خوارەوە بەرەو بەرزاییەکان دەهاتن، لە خۆڕا و کوێرانە تەقەیان دەکرد، ئەو ناوەیان دابێژا، گەلێک جاریش سێ-سێ و چوار-چوار بە جارێک دەتەقینەوە، هاژەهاژ و گفەگفی پارچە تۆپ بەسەر سەرماندا دەیگێزاند، هەر کە گوللە تۆپەکان دەتەقینەوە، بلاچەیێکی سەیر و ناڵەیێک دەروونی پیاوی دەهەژاند، وردەوردە تۆپبارانەکە وەستا، ئەوجا دەنگی دۆشکا و ڕەشاشی دی بەجوانی دەبیستران، ئەویش سەبارەت بەوەی هەندێک کاس ببووین، ئەو دەنگانە وەک دەنگە ئاساییەکانی خۆیان نەبوون، هەر گوللە بوو بەسەر سەرمانا گیزەی دەکرد، گەلێک جاریش بە ئاستەم سەرمان بەرز دەکردەوە و گڕی تەقەکانمان دەبینی، لە بنارەوە بەرەو ئاسمان و لووتکەکان هەڵیاندەدا، چ کەسێکی ئێمە تەقەی نەکرد، تا (ئەوان) بەدەم تەقەکردنەوە نزیک بوونەوە - هەر ملیان دەنا - لە چاو تروکانێکا بە جۆرێک هاتینەدەست، سەدان کەس بە جارێک دەیانگوت (یا ویلی) هەر چی جاشە کوردەکان بوو شارەزای شەڕ بوون و بەشێکیان توانییان پەنا بەرد و کەند بکەنە سەنگەر، بەڵام عەسکەرەکان چەکەکانیان فڕێ دەدا و بەرەو خوار دەبوونەوە. ئیدی

چاکتر دەکەوتنە بەر ڕێژنەی کلاشینکۆف... چاکم وەبیر دێتەوە، ئەو ڕۆژە زۆر دەترسام، ئەم پێشمەرگەیەی لەگەڵ مندا لە یەک سەنگەر بووین، لە سەرەتادا منئاسا دەترسا، شەرممان لە یەکدی دەکرد، بە بیانووی سەرما، ڕێمان بۆ لەرزی لەشمان خۆش کردبوو... هەر کە تەیارەکان بۆمبا و ساروخەکانیان وەشاند و ئەو ناوەیان کردە دووکەڵ و تەپوتۆز، هەستمان دەکرد هەناومان داتەپی، هەر کە تۆپێکیش لە نزیکی سەنگەرەکەمانەوە دەیدایە زەوی، بە جۆرێک گرژ دەبووینەوە و سەرمان بە یەکەوە دەنا، بە دوو منداڵی زەندەقچوو دەچووین، لە کاتی تۆپباراندا، هجوم ناکرێت و نابێت سەر بەرز بکرێتەوە، کەچی ئێمە جارجارێک - پێم وایە لەبەر ترس بوو - سەرەتاتکێمان دەکرد، دەشمانزانی پاش تۆپباران هجوم دەبێت و واش دەخوازێت چاوێک بکەینە هەزار چاو، گەلێک جار باوکم دەیگوت:

- کوڕ ئەو کوڕەیە لە تۆپباراندا جێی خۆی چۆڵ نەکات، بزمارئاسا لەنێو سەنگەرەکەیدا خۆی دابکوتێت...

هەر کە هاوڕێکەم پێی گوتم:

- وریا بە نزیک کەوتوونەتەوە.

گەلێک کەیفخۆش بووم، کە بینیم ئەوانەی بۆ لای قوتەکەی ئێمە دەهاتن و کوێرانە تەقەیان دەکرد، بە مەزەندە سی - چل کەسێک دەبوون، گەلێکیش پەرت و بلاو بوون، لە دڵی خۆمدا گوتم:

- (مستەفا، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە چاوەڕێت دەکرد، دەی پیاوەتی خۆت بنوێنە، پێش ئەو کاتە وام دەزانی کوشتن ئازایەتییەکی لە ڕادەبەدەری دەوێت و کەم کەس توانای کوشتنی هەیە، کەچی هەر ئەوکاتە

سووکە قسەیێکی باوکم مێشکمی هەژاند و گوێیەکانمی زرنگاندەوە (داگیرکەرکوشتن لە ئاوخواردنەوە ئاسانترە!).

کەم تەجرەبەیی من و پێشمەرگەکەی هاورێم وایکرد هەندێک دوابکەوین، پاش بیست - سی سانییەک، ئەوجا ئێمە هاتینە دەست، داخەکەم لە هەموو پێشمەرگەکان کەمتر داگیرکەرمان ئەنگاوت.

پێم وانییە لەو تەمەنەمدا چ خۆشییەک پارسانگی خۆشی و بەختەوەری ئەو ڕۆژەم بووبێت، وا من و پێشمەرگەکەی هاورێم بە (تاک تیر) تەقەمان دەکرد و جێ تەقەکانی خۆشمان دەبینی، چ نیگایەکیش هەندەی بەلەخورد و لنگەوقوچبوونی داگیرکەری دوژمن جوان و ورەبەخش نییە، کە هەرچی ڕقی پەنگاوەت هەیە لەگەڵ گوللەیەکدا بۆی دەنێریت، ناوچاوان، سەرسنگ، هەڵدەتەکێنیت، مۆری پیاوەتی خۆت دەچەسپێنیتە ئەو لەشە پیسەی کە - هەرچییەکت هەیە خستوویەتە ژێر پێڵاوەکەی - .

ئاگری جەهەنەممان بۆیان داگیرساند، بە جۆرێک سەریان لێ شێوابوو، بەرەو خوار دەیانقوچاند، سەرسمی ئەوتۆیان دەدا و هەڵدەدێران، دەبا خۆزیایان بە گوللە خواستبا، لە یەک - دوو دەقیقەدا بەرەو خوار بوونەوە، ئێمەیش لە هەموو لایەکەوە بە گوللە خواحافیزیمان لێ دەکردن، چ جارێک وەکوو ئەو ڕۆژە نەمبینیبوو، گەر باسیش کرابا، باوەڕم نەدەکرد کە دوژمنی داگیرکەر بە هەرهەموو چڵکاوخۆرەکانیەوە هەندی ترسنۆک و بێفەڕن، هەند خوێڕی و بێمودن، لە مەیدانی شەڕدا مشکن، لە شاران و بۆ بێچەک و هەزاران سەگی هارن، لەو کاتەدا سووکە خەیاڵێک بە مێشکما گوزەری کرد (گەر ئێمە سەدایەکی چەکەکانی ئەوانمان هەبا، تۆ بڵێیت لە خەونیشیان بیانوێرابا سەیرمان بکەن)...

(ئەوان) دڕیان تێکەوت و کوێرانە تەقەیان دەکرد... سەرەڕای سەرما،

گەلێک تینووم بوو، هاوڕێکەشم منئاسا قوڕگی وشک ببوو، بە هەر دووکمان نیوە مەتارەیێک ئاومان خواردەوە...

(ئەوان) یەک - دوو جاری دیش وەخۆ کەوتنەوە و هێرشیان دەهێنا تا مەیتەکانیان ببەنەوە، کەچی هەر جارەو ئەوەندەی دیشیان لنگەوقوچ دەبوون، تا ئێوارەیێکی درەنگ ئەمە بەزمیان بوو... من پێم وابوو ئەگەر دە جاری دیش هێرشیان هێنابا، هەر تووشی هەمان چارەنووس دەبوون، کە دنیا تاریک بوو، هێدی هێدی تەقە وەستا و ئەوان کشانەوە، پێش وەخت شوێنی کشانەوە و کۆبوونەوەیان بۆ دیاری کردبووین، شوێنەکەش هەند دوور نەبوو، پاش ئەوەی چەند حەرەسێکی وریایان دانا، وردەوردە کشاینەوە، من و هاوڕێکەم دوا کەس بووین گەیشتینە شوێنی دیاریکراو، یەکسەر لە شوێنی خۆمدا حەپەسام، زانیم شتێک بووە، هەرهەموو پێشمەرگەکان خەمبار بوون، لە سەرنج و سیمایان تێگەیشتم شەهیدمان هەیە، بۆ ساتەوەختێک ڕووخساری سەراپای پێشمەرگەکانی هاوڕێم خۆی ئاخنیە نێو فکرم، دەبێت کێ بێت؟

نزیک بووینەوە، باوکم بینی سەرشانی خوێناوی بوو، وام زانی بەرکەوتووە، لە هەموو پێشمەرگەکان کەمتر غەم بە ڕووخساریەوە دیار بوو، بە بێدەنگییەوە لە تەنیشتی تەرمێکی بە جامانە داپۆشراو دانیشتبوو، جگەرەکەی لەنێو لەپی هەردوو دەستیا بوو، بە توندی مژی لێدەدا، هەر کە چاوی بە ئێمە کەوت، بێئیرادە لەبەرمان هەڵسا، یەکسەر وشەیێکی وەک فیشەک چزانە دڵمەوە:

- ئەحمەدی برات شەهید بوو.

لەوەتەی هەم، ڃ جارێک ئاوها بلاچەی ئاگر لەناو چاومەوە هەڵنەستاوە، کە دامە پرمەی گریان، باوکم شەپازللەیێکی پیاکێشام ئەو

دنیـام بـە چـاوی خـۆم بینـی:

باوکم نەڕاندیە سەرم:

- پیاو... تۆ پیاویت... پیاو چۆن دەگرییێت، هەی داوەشێیت!

ئەوجا ڕووی لە پێشمەرگەکان کرد:

- کوڕینە، ماتڵ مەبن، هەر لێرەدا قەبرێک هەڵبکەنن.

پاش دە - دوانـزە دەقیقەیێـک، قەبـر سـاز بـوو، مـن لـە دورەوە سـەیرم دەکـرد و دەکـولام، باوکیشـم وەک ئـەوەی هـەر هیـچ نەبووبێـت، ئاوهـا ڕەفتـاری دەکـرد، نەمزانـی چ بـوو هانیـدام خۆزیـا بـەو دڵـەی بخـوازم، تـا ئەوکاتـە چ کەسـێکی نزیکـی خۆشەویسـتم نەمردبـوو، کەمتـر لـە غەمـی جیابوونـەوە و مـردن تێدەگەیشـتم، هـەر کـە سـەری قەبرەکـەی ئەحمـەدی برامیـان داپۆشـی، بەرچـاوم تاریـک هەڵگـەڕا، کسـپەیێکی ئاگریـن ناخمـی هەژاند، لەنێو شـەرم و حەزێکـی سـەیردا گێژ و کاس بووم، حـەزم دەکرد هەرچـی فرمێسـکم هەیـە بـە جارێـک دایبارێنمـە سـەر قەبرەکـەی و کـەف و کوڵـی دڵـم دابمرکێنـم... شـەرمیش لـە پێشـمەرگەکانی هاوڕێـم، وای لـێ کردبـووم ماتەمینییێکی ئەوتـۆ دامگرێـت، سـەراپای هەمـوو شـتێک بـە ڕەشـی بخاتـە بەرچـاوم، سـەرئەنجام، شـەرم زاڵ بـوو و حـەزی گریانمـی سـەرکوێر کـرد.

(ئەڵبەتە پاش ئەوەش، گەلێک جار شەرم جڵەوی زۆر شتی تایبەتیمی بە دەستەوە گرت، وەک چاوساغ ڕێنمایی دەکردم، ناڵێم بەرەو چاکە و لەنگەری هێمنی دەبردم، نەخێر، بێدەنگی و ئارامی پێ دەبەخشیم، ئیدی هەستم بە جۆرە قەرزاربارییێک دەکرد، خۆم بە قوتابی شەرم دەزانی، پێم وابوو شەرم مامۆستایەکی چاکی من بوو، فێرە دانبەخۆداگرتن و سنگفراوانی کردم... دیاریش دەکرا، بە بێدەنگی و بەئاڵۆزیش ژیانم هەر دەگوزەراند، بەڵام بە تام و چێژێکی دییەوە... جا کێ دەڵێت چاکتر و پوختەتر نەدەبوو؟ بە هەرحاڵ، ژیانم دەگوزەراند، یا ڕاستتر، ژیان دەیگوزەراندم و بەرەو ئەمڕۆ و (ئێستا)ی دەهێنام، ئەوی دی هەرچییەکی بووە، یا هەرچییەکی دی دەبێت، پەیوەست نییە بەوەی ڕادەی قایلبوون، یا پەشیمانیم سەرئەنجامی دیاری کردبێت، بەڵکوو سەرئەنجام هەر هەمان دۆخ و قەوارەی خۆی - ئێستا ئاسا - ی دەخستە سەرپشکبوونم، ئەویش لە ڕووی هەر هەمان پرسیارە ئەزەلییەکان، دەستەوەستانی دەکردم، چیم؟ چی دەکەم؟ بۆ دەیکەم؟ پێم وایە گەر وەڵامێکی دروستی ئەم پرسیارانەم لا دروست بێت، ئیدی چ پاکانییێک بۆ بەردەمی ژیانم نامێنێت... چێژی ژیان لە نهێنی و قورسی وەڵامی پرسیارە ساکار و گەوجانەکەیدا وەدەر دەکەوێت!

پێشم وا نییە ئەم پرسیارانە پەیوەست بن بە ڕووداوەکانی (ئێستا) ی منەوە، بەڵکوو زادەی تەمەنێکی پڕ لە تاڵی و تفتی، پڕ لە چێژ و

ئارەزووی ژیانویستی و خۆشەویستین! ئەوسا، عەقڵی ئەوکات و ئەو سەردەم، جڵەوی ڕەفتارمی لە دەست گرتبوو، هەرچییەکی ئەوکاتە هەستم پێ کردبێت، یا کارم پێ کردبێت پەیوەست بووە بە (کات، فام، بۆچوون) چاک بووبێت یا خراپ، نامەوێت بە عەقڵی ئێستام حوکمیان لەسەر بدەم، دەشێت حوکمی ئێستام لە ڕووی نەزانینەوە بێت، بەڵام لەو سەردەمەدا زانیومە).

هەر کە باوکم گوتی:

- (سەرەتای بێهودەییکی تەڵخ بەرچاوی گرتم، یەکەم جاری تەمەنم بوو، کە پرسیارێکی بێشەرمانە بخەمە ڕوو، لە خودی خۆمی دووبارەکەمەوە (ئا ئەم ژیانە شایستەی ئەوەی هەیە مرۆڤ تێیدا بژی؟ ئەوەندە دەهێنێت؟ جا بۆ هەموو مرۆییێک ڕووبەڕووی ئەم تەجرەبە و ئەم سەرئەنجامەش نایێن؟ بۆ ئێمە لەلایەن چارەنووس و کەسانی دییەوە، کەری باری حوکمێکی گرانی ئەم ژیانە کولەمەرگییە و ئەم سەردەمە بین، بۆ؟ ئەگەر دڵی خۆ بەوە خۆش کەین، گوایە کوێرەوەری فێرە تێکۆشان و ئازایەتیمان دەکات، چاکتر پتەو و پوختەترمان دەکات، پێم وایە تاقە وەڵامێکی ڕێک بۆ ئەم پرسیار و پاکانەیە تەنها، (تڕحێو) ە... خۆخەڵەتاندنێکی گەلێک بێسەروبەر و بێسنورە، ئەوە نییە لە سووکە بیرکردنەوەکانی خودیماندا بزەییکی تەوسئامێز دامانەگرێت و شەرم لە خۆمان و لە قسە زلەکانی خۆ دەکەین، ئەوە نییە لە ڕۆژێکدا دەیان جار بە دەیان ڕوو خۆ دەبینین، سەد حەیف و مەخابن لە هەموو داگیرکەرێک زیاتر خۆ داگیر دەکەین).

دوو پێشمەرگەی دی لەگەڵ من و هاوڕێکەمدا بەرەو سەنگەرەکەی خۆمان گەڕاینەوە، ئەوان حەزیان دەکرد، لە بری من و هاوڕێکەم بچینە

نێو سەنگەرەکەی ئێمە، کەچی لەبەر باوکم ئەوانیش نەیانویست ڕووداوە ناهەموارەکە خەستتر بکەن... پێشمەرگەکان وەک ئەوەی خواردنیان لەبیر کردبێت، چ کەسێکیان پاروە نانێکی لە دەم نەنا... سەنگەرەکەی ئێمە گەلێک گەورە بوو، لە جێی کۆنە ڕەبایەیێکی پاش ئاشبەتاڵ بوو، یەکێک لە پێشمەرگەکان بە منی گوت:

- هەر لەگەڵ تۆپبارانی یەکەمدا ئەحمەدی برات بەرکەوت و یەکسەر شەهید بوو...

بێدەنگ بووم، لە سەرمانا هەڵدەلەرزیم، دەست و پەنجەم گۆی نەدەکرد، وەک ئەوەی زمان و قسەکردنم لەبیر چووبێتەوە، ئاوها وڕ و کاس و بێدەنگ بووم، ئەڵبەتە گەلێک شتی پەنگخواردوو لە ناخمدا بوو بیڵێم، بەلام بە جۆرێک تاسە بردبوومیەوە، کەمتر هەستم بە بوونی خۆم دەکرد... هەرچەندم هەوڵ دەدا ڕووخسارە بزێوەکەی، جووتە چاوە هەمیشە غەمبارەکەی ئەحمەدی برام، لە بەرچاوم لا نەدەچوو... مەنگەکەی ئەم دواییەی، پرسیارە سەیر و بەجێکانی، جورئەتی، ئەو ڕۆژەی کە لەڕووی باوکمدا وەستا و پێی گوت:

- ئەوە چیتە، لە خۆتەوە بە ناوی ئەم و ئەوەوە قسە دەکەیت؟

تووڕەبوونە بێسەروبەرەکەی باوکم، کە پێی گوت:

- ئاخرزەمانە... فیسقە گولێک لێم بووەتە (فەرمەسۆن) بڕۆ هەی دەمڕووت، بۆ هەموو شتێک هەر بە کتێب خوێندنەوەیە، تۆ نایزانی.

کە ئەحمەدی برام قسەکەی دووبارە کردەوە و زیاتریشی گوت:

- من کەی باسی کتێبم کردووە، من دەڵێم بە ناوی ئەو

گەورەپیاوانـەوە قسـە دروسـت مەکـە...

کەچی باوکم بە جۆرێک قسەکەی لە دەم قۆزتەوە، ئەحمەدی برام و هەموو ئەوکەسانەی گوێبیستی بوون، هەر هەموو حەپەسان، کە گوتی:

- گەورەپیاو، گەورەپیاوی چیتە... ئەوان گەورەپیاوی وڵاتی خۆیان بوون... وڵاتی ئێمە گەورەپیاوی بە جۆرێکی تر دەوێت... بۆ پێت وایە ئەم لیلین و مانکسەی تۆ باسی دەکەیت، لەنێو ئێمەدا بان هەر بە گەورەپیاو ناو و ناوبانگیان دەردەکرد؟ یا هەر پاش مردنیان سەد تف و نەعلەتمان بۆ قەبری باب و باپیرانیان دەنارد، گەلێک چاک بوو لەنێو ئێمەدا نەبوون، ئەگینا شێتخانەکانیش نەیاندەگرتنە خۆ، کێ لەناو ئێمەدا بە دەقی خۆیەوە دەمێنێتەوە؟

توورەم مەکەن با قسەی زیاتر نەکەم... ئێمە هەر ئەوەتا هەین، دەنا نەزانین و خوا ئاشەکەمان بۆ دەگەڕێنێت، ئەوە من قسە ناکەم و ئێوەیش پێتان وایە ئیدی من هەر هیچ نازانم و ئەوەی ئێوە بیڵێن - ئەشهەدو - ەکەی لەسەر من بێت، ئەشهەدوبیلا وا نییە... گەلێک جار گوێم لە فلتەفلتی هەندێکیانە، شەو تا بەیان (دەوەن بەئاش دەکەن) قسەی زل و قسەی زل... فلان وای فەرموو، دەبێت ئێمەیش وا بکەین، فیسار لە فلانە ساڵدا بۆ فلانە کێشە ئەو کارەی کرد، دەبێت ئێمەیش وا بکەین... هەی بەرخوردار بین، کەی وایە؟ ئێوە تا ئێستایش من بە کابرایەکی گەوج و نەفام دەزانن، پێتان وایە من حەز لە کوشتن و کوشتنکاری دەکەم... ئێوەیش بۆ پێکەنینی خۆتان سەرتان دەنایە سەرم.

کەچی ئەحمەدی برام زۆر بەهێمنی وەڵامی دایەوە و پێی گوت:

- چاکە، تۆ ئەم قسە و باسانە دەزانیت، بۆ تا ئێستا قسەی وات

نەدەکرد؟

- قسە لە کات و شوێنی خۆیدا قسەیە...

هەموو ئەم قسە و باسانە لەنێو دید و مێشکما لەنگەریان گرتبوو، نەمدەزانی کات چۆن دەگوزەرێت، وردەوردە سەرماکەیش زیادی دەکرد، ئەو شەوە تا سەعات دە و نیو چ دەنگ و خشەیێک نەبوو، لە پڕ لەملاو ئەولامانەوە بوو بەگرمە و دەستڕێژ و بێدەنگی شەوی شەقار کرد، بێئیرادە و یەکسەر هەڵسامە سەر پێ، پێشمەرگەکانی هاوڕێم دایان نام، دەنگی ئار پی جی ئەوناوەی دەهەژان، تەقە گەرمتر بوو، هاوڕێکانی نێو سەنگەرەکەم هاتنە دەست، تمەس جاش و جەیش بە بێدەنگییەوە دزەیان کردبوو، خۆیان لە قوتە بەرزەکان نزیک کردبووەوە. ئای لەو شەوە، مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت چییان بەسەر هات، (هاتن بۆ ڕیش، سمێڵیشیان نایە بانی) پێشمەرگەکان بە ڕقێکی ئەوتۆوە تەقەیان دەکرد، باوکەڕۆ و (یا ویلی) لەنێو دەنگی تەقەکانەوە دەبیستران، لە نیو سەعاتێک زیاتر تەقە درێژەی کێشا، وردەوردە تەقەکان کەمتر دەنگیان دەهات، ئەویش سەبارەت بەوەی باییکی توند و سارد، تازە هەڵیکردبوو و گیفەگیفی دەهات، هەر لەگەڵ کزبوونی بایە ساردەکە، بەفر دایکرد، ئای لە سەرمای ئەو شەوە، ئای لەو زریانە بێئامانە چی بەسەر هێناین و بە چ دەردەسەرییێک پێشمەرگەکان گەیشتنە خوارێ، لە جێی دیاریکراوی کۆبوونەوەمان، هەندەی نەمابوو بەشێکمان ڕەق بێتەوە، ئەوجا تا هێز لە ئەژنۆدا بوو، تاوی هەنگاوەکانی خۆمانمان دا، دوورکەوتینەوە، تاریک و ڕوون بوو، هێشتا بەفر هەر پروشەی دەکرد، لە پانایێکدا لاماندا، ئەوەندەی نەمابوو لە پەلوپۆ بکەوین... ئای چ ڕۆژێکی سەختیشمان گوزەراند، ئێشی لەش، ماندوویەتی، برسیەتی، ڕق و کسپەی دەروون، هەموو تێکەڵ ببوون - پاشان بیستمان، چەن عەسکەر و جاش کوژران

و بریندار ببوون، ئەوەندەش لێیان ڕەق ببووەوە - هەر ئەو ڕۆژە باوکم بە دەنگێکی هەندێک غەماوییەوە پێی گوتم:

- کوڕم مستەفا، بچۆوە بۆ ماڵ، چەند ڕۆژێک لەوێ بە، پاش چەند ڕۆژێکی دی خۆشم دێمەوە، شەهیدبوونی ئەحمەدی برات لە مەحموود و دایکت نەشاریتەوە، بێ سێ و دوو و ڕاستەوڕاست پێیان بڵێ... حاڵی بوویت... پێیان بڵێ شین و شەپۆڕ نەکەن... ئەحمەد مایەی سەربەرزی هەموومانە...

(باوکم کە پێی دەگوتم) (دایکت هەموو قەناعەتێکی وا بوو، کە لە ڕووی سۆز و خۆشەویستییەوە چ کەمتر نییە لە دایکی خۆم، لە ڕاستیدا دایکم گەر لە ژیاندا مابا، هەر ئەوەندە ڕێزی لێ دەگرتم، زڕدایکەکەم نەک فەرق و جیاوازی لە بەینی من و براکانمدا نەدەکرد، بەڵکوو گەلێک جار لەبەر دڵی من لەوان زیاتر دەیلاواندمەوە، گەلێک بەپەرۆشەوە جل و بەرگی بۆ دەشۆردم و نازی دەکێشام. چەند قسە و حیکایەت و زوڵمی هەندێک لە زڕدایکان، ڕەنگدانەوەی ڕەفتاری باوکە، کە ڕێ خۆش دەکات و جڵەو شل دەکات، ئەوجا زوڵمەکە پەیدا دەبێت).

ئەو ڕۆژە بەبێدەنگی ملی ڕێم گرتە بەر، هەزار و یەک خەیاڵ و وێنەی جۆربەجۆر لەنێو سەرمدا بە تێکەڵوپێکەڵی دەجەنگین، لەگەڵ هەر خەیاڵێکمدا، پرسیارێک ڕووی تێ دەکردم، چ وەڵامێکی ئەوتۆی دروستم پێ نەبوو دڵە کەیلەکەم داساکێنێت، ئیدی خەیاڵێکی تر و تر مێشکمیان کردە مەیدانی جەنگ، لە خۆمم دەپرسی چۆن سەری باسەکەیان لەگەڵدا بکەمەوە، خۆ ناشێت لە پڕ باوکمئاسا، بێ سەلام و کەلام، یەکسەر پێیان بڵێم ئەحمەدی برام شەهید بووە... هەندێک وەڵامی پچڕپچڕم کردبووە دەسکەلا و دڵی خۆمم پێیان دەدایەوە: سەلام دەکەم، لە پێشدا

چاک و خۆشییان لەگەڵ دەکەم، ئەوجا وردەوردە دێمە ناو باسەکەوە...

هەر دیسانەوە لە خۆمم دەپرسی: چاکە... گریمان توانیم دەست بەسەر وشەکانما بگرم، خۆ ناتوانم دەست بەسەر ڕەنگی ڕووخسار و شێوەی دەنگەکەم بگرم.

سەرتاسەری ڕێ لەم سێ و دووەی دڵی خۆمدا بووم، بە هیچ جۆرێکیش ڕووخساری ئەحمەدی برام لە بەرچاو لا نەدەچوو... ئیدی ڕێ و هەنگاوی من، مێشک و خەیاڵەکانم، چاوم - کە پڕ لە ڕووخساری ئەحمەدی برام بوو، لەنێو ئەو ڕۆژە سەختەمدا ببوونە سەرەتا و ئەلف و بێی وانەیێکی گەلێک سەنگین، ئەویش بەخۆداچوونەوە و چەسپاندنی بۆچی ئەو ژیانە پڕ لە بێهودەییەی کە بێ ویست و دژ بە خەون و هیوام دەیهاڕیم، سەدان پرسیاری بەجێ و بێسەروبەریش، دەیان وەڵامی نیوەناچڵی کردبووە تێشووی ئەو سەفەرە ناحەزەم - کە بە هەواڵێکی سامناک دووگیان بوو.

ئەو ڕۆژە ڕەشبینییێکی ئەوتۆ تێکەڵی ماتەمینییەکەم ببوو، حەزم بە لەناوچوون و نەمانێکی ئەوتۆ دەکرد، چ قەبر و سێبەر و یادێک لە پاش خۆمەوە جێ نەهێڵم، وەک دەڵێن، ڕۆحیش عەزیزە، دەنا ڤیشەکێک ئیسراحەتی هەمیشەیی پێ دەبەخشیم و ئەو ڕۆژەشم نەدەبینی...

(ئێستا) خەم بۆ بێدەسەڵاتی ئەو ڕۆژەم دەخۆم، بۆ ئەو کارەم نەکرد و دەستم نەچووە خۆم، بۆ هەند دوژمنێکی کەللەڕەقی ئەم ڕۆحە ئەزیەتدیدەی خۆم بووم، بۆ؟

دەشێت (ئێستا)یش لەم ڕووەوە هەر هەمان بێدەسەڵاتەکەی جاران بم و ئەو پاکانە پڕوپووچە بکەمە بناغە بۆ بەردەوامی ژیانم و بڵێم،

(ڕۆح عەزیـزە).

گەیشـتمە ماڵێ، هـەر لـە بـەردەرگادا، چاوەکانـم هەمـوو شـتێکی بـاس دەکرد، چەندم پێ سـەیر بوو، وام زانی زڕدایکەکەم، هەرچی قوڕی ئەو ناوەیـە لـە سـەری خـۆی دەنێت، کەچـی، پـاش چەنـد دڵۆپـە فرمێسـکێکی گەرم و بێدەنگ، دەسـتی بەسـەر مەحمودی برامدا دەهێنا و فرمێسکەکانی چاوی ئـەوی دەسـڕییەوە - کـە بـە دەنگی بـەرز دابوویـە پڕمـەی گریـان... زیاتـرم پێسـەیر بـوو، کـە زڕدایکەکـەم گوتـی:

- سـەربەرزییە بۆ من دایکی شـەهیدێک بـم... دایکی ئەوتۆ هەیـە سـێ - چـوار شـەهیدی هەیـە... منیش ئێسـتا وەک ئـەو دایکانـە سـەربەرزم... ئـای کە سـەربەرزم!

گەلێک لـە خۆم دامـام، نەمزانـی چ شـتێک وا بێهێزی کردبـووم، کە هۆن هـۆن فرمێسکی ئاگریـن بـە چاوانمـا دەهاتنـە خـوارێ. کەچـی زڕدایکەکـەم بـە جۆرێـک دڵـی دەدامـەوە، شـەرمم بـە خـۆدا دەهاتـەوە... قسـەکانی زڕدایکەکـەم، لـە شـەپازللەکەی باوکـم گەلێـک بەهێزتـر بـوو، باوکـم بڵاچـەی لـە چاوانـم هەڵسـاند، زڕدایکەکـەم ڕۆشـنایی ئاگرێکـی هەمیشـەیی خسـتە دەروونمـەوە، کـە پێـی گوتـم:

- کـوڕم، هەمووتـان، هەرهەمووتـان بـەلای منـەوە شـەهیدن... ئەمـڕۆ نـا، سـبەی، دووەی مـن وەک (شـەهید) سـەیرتان دەکـەن!

پاشـان زۆر بەهێمنی بە من و مەحمودی برامی گوت:

- (ئێسـتا) ئێوە لەنێو هاوڕێکانتان سـەربەرزن.

دەمویسـت پـڕ بـە دەم تـف لـە خـۆم بکـەم... گەورەیـی ئـەو زڕدایکـەم

چکۆڵەیی منی دەسەلماند، ئیمان و ورەی، سەبر و تەحەمولی ئەو، پووچەڵی منی دەردەخست، بێدەنگی و دانبەخۆداگرتنەکەی، نەفامی و گەوجی ئەوسای منی لە ڕووی خۆمدا دەخستە ڕوو... ئەو نەخوێنەوار و بەستەزمانە، لە ڕۆژگار و نەهامەتییەوە فێری دانبەخۆداگرتن و ئیمانبەرزی ببوو، منیشی فێری وانەیێکی گەورەی تەحەمول کردا!

پێم سەیر بوو، کە لە ئەشکەوتی (ئەژدیها)دا بووین، سەد قسەی دەکرد، گەلێک بیانووی بێسەروبەری بە باوکم دەگرت، چۆن ئاوها بەم خوێن ساردییەوە ئەم هەواڵەی وەرگرت، چۆن؟ وەک ئەوەی درکی بەم هەستەی من کردبێت، یەک - دوو جار لەسەریەک گوتی:

- چ دەسەڵاتێک بەرانبەر بە ئیرادەی خوا نییە... خوایە سەد شوکر بە بەشت.

***

ئەو ساڵە، زستانەکەی گەلێک سەخت بوو، ئێمە لە ماڵێکدا چ پێویستییەکی ئەوتۆمان نەبوو، پێشمەرگەکان لە هەموو ڕوویەکەوە یارمەتییان دەداین، زۆر شتیان بۆ دابین دەکردین... بە گشتی وەزعی پێشمەرگەیش هەندێک کش و مات بوو، جارجارێک نەبێت کە پێشمەرگەکان ڕوویان لە هەندێ ڕەبیە دەکرد، هەندێک جاریش بۆسەیان دەنایەوە... شارەکان لە خراپەوە بۆ خراپتر دەچوون، ئیعدامکردن لە برەودا بوو، بەندینخانەکان ئاوەدانتر ببوونەوە، میری گەورە و بچوکی نەدەزانی، پیرەمێرد گەر لەژێر تەعزیبدا نەکوژرابا، ئەوا ئیعدام دەکرا، منداڵ، ئافرەت، ئەوی دەستی کەوتبا، تاوانی سەرەکییان ئەوە بوو، کە کورد بوون و هیچی تر... گەلێک گوندی دیش بەر ڕاگوێزتنەوە کەوتن، دار و بەردیان بەسەر یەکەوە نەدەهێشت، بە دەنەمێت و بلدۆزەر، بە تەیارە، بە تێزاب دەسووتێندران...

لە هەموو لایەکەوە، میری بەڵا و ئاگری دادەباراندە سەر کوردان، پێم وا نییە چ کوردێکی بەشەرەف پریشکی بەر نەکەوتبێت... داخی گرانم، ئەو سەردەمە لە ڕووی پرسیارێکی قورسدا بێ وەڵام بووم، هەر چەندم دەکرد و دەکۆشام، چ وەڵامێکی ئەوتۆی ماقوڵم وەدەست نەدەهێنا. ئەویش نەمدەزانی بۆ زۆربەی زۆری ئەو جاشە کوردانە هەمان ئەو زەنگ زەبەدیەن زەبروزەنگی میرییان چەشتووە، کەچی چەکی خیانەت و خۆفرۆشییان بۆ زاڵمی خۆیان هەڵگرتبوو!

ئەو ساڵە گەلێک لە قوتابیانی قوتابخانەکەی دێیەکەی خۆمانم بینی، هەموو گەورە ببوون، دابەش ببوونە سەر مەفرەزە و تیپەکان، لە ناوچەکانی دیدا پێشمەرگە بوون، وام دەزانی لە ئاسمانەوە هاتوون، هەند کەیفخۆش بووم، لە ڕادەبەدەر کەیفخۆش بووم، گەلێک جار، لەبەر قسە و یادگاری و گێڕانەوەی سەرگوزشتە، لەگەڵ ئەو قوتابییە پێشمەرگانەی هاوڕێم، خۆمان لەنێو دنیایەکی دیدا دەبینییەوە... وەک ئەوەی ئومێدی پیرۆزمان وەدی هاتبێت، ئاوها بەختەوەرانە قسانمان دەکرد. هەرهەموو لە قوتابخانەدا و بەپێی ڕێنماییەکانی مامۆستا بەکر، ئاواتمان بە پێشمەرگە دەخواست... بە بزەوە سەیری یەکدیمان دەکرد، لە تاقم و جۆری کلاشینکۆف و مەخزەن، لە تەوزیع و مزگەوت و جەولەی یەکدیمان دەپرسی... هەر یەکە بەشانازییەوە باسی تەجرەبەکانی خۆی دەکرد، یەکەم ڕۆژی پێشمەرگایەتی، یەکەم شەڕ و یەکەم تەقە، سەرباسی قسەکانمان بوو، ترس و زاڵبوون بەسەر ترس... سەرئەنجامێکی بەسوودی ئەو تەجرەبەیە بوو، کە هەرگیز کتێب و باسکردن، ئەو تام و چێژ و سەرئەنجامەی نەدەداینێ... گەیشتمە قەناعەت، پێشمەرگایەتی چەند پیاو قاڵ دەکات، دوو ئەوەندەیش پیاو دروست دەکات، ئەوە قالەی حەمە ڕەشید، تا لە قوتابخانە بووین، منداڵێکی ڕەنگ زەردی هەمیشە نەخۆش، لاواز، کەمتر دەهاتە نێو گەمە و یارییەکانمان، لە قوتابخانەشدا تەمەڵ

بوو، هەندێک منداڵی چەتوونیش گاڵتەیان پێ دەکرد، کەچی ئەوەتا بە شاهیدی هاوڕێکانی، کوڕێکی ترە، ئازا و چاونەترس، بزێو و چاپوک، هەشت مەخزەن، دوو ڕومانە و دەمانچەیێک بووە بە ئەندامی لەشی و لێی جیا نابنەوە، جارێک بریندار بووە، یەک - دوو جاری دیش بە موعجیزە لەنێو کەمینی گەورەدا دەرباز بووە... سەرەڕای ئەمانەیش، وەک کادیرێکی لێهاتوو هەمیشە کتێب و بڵاوکراوە بۆ هاوڕێکانی شی دەکاتەوە، قسەزان و هێمن، گوێڕایەڵ، هەموو ئەمانە وەک خۆی دەیگوت - ئەلف و بێی زانستی - پێشمەرگایەتین...

یەک - دوویەکی دیی قوتابیە پێشمەرگەکانی هاوڕێم، بریندار بوون، بە ڕاستی شایستەی ستایش بوون، جێی خۆی بوو شانازی بەو ئەستێرانەوە بکەن، کە باسک و سنگ و پشت و ڕانیانی ڕازاندبووەوە، شاهیدی کەڵەمێردی بۆ دەدان... لەو ماوەیەدا مەحمودی برام کرا بە ئامرمەفرەزە، باوکم هەر برا گەورە بوو... لە بەهاردا مەحمود کرا بە ئامرکەرت، باوکم هەر بە برا گەورەیی مایەوە... زڕدایکەکەم، بە نەخۆشییەکی نادیار مرد، چ کەسێک نەیزانی چۆن وا لە ماوەی دە ڕۆژێکدا، وا لاواز بوو، تەنها پێست بە ئێسقانەکانیەوە مابوو، لە ئێوارەوەختێکدا گەلێک بەبێدەنگی گیانی سپارد... وەک ئەوەی ڕۆحی ئەو حەبل بووبێت، شیرازەی خانەوادەکەمان تێک چوو، وای لێهات بە مانگ من و مەحمودی برام باوکمان نەدەبینی... باوکیشمان، لە بەزم و ڕەزمی خۆی نەکەوتبوو، فێری هەندێک ناوی وەک گیڤارا و ماو ببوو، مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت، بە ناوی ئەوانیشەوە چ قسەوباسێکی هەڵبەستبوو، چەندین ناوی کتێبی بۆ دانابوون! من و مەحمود بیستمان، گوایە باوکم لەو ڕۆژانەدا عەوداڵی بێوەژنێکە و نایدەنێ! من بەش بە حاڵی خۆم، حەزم دەکرد ژنێک بێنێ و هەندێک داساکێت، کەچی لەبەر دڵی مەحمودی برام، ئەو حەزەم دەرنەدەبڕی... هەر کە جارجارێک

باوکمم دەبینی، یەکسەر لێی دەپرسیم:

- ئەرێ مەحمودی برات نەبوو بە سەرتیپ؟

- دەبێت.

- کەی؟

- خۆت نالێی شۆڕشەکەمان درێژخایەنە.

- وابێت تۆیش بەتەمایت.

منیش بەتەوسەوە پێم دەگوت:

- باوکە، من و تۆ بەیەکەوە دەبینە سەرتیپ.

- نەخێر کوڕم، من ناکەن بە سەرتیپ... حەقیانە و منیش ئەوەم ناوێت... دەزانم ئەم ئیشە لە تاقەتی مندا نییە... من هەر دەزانم تەقە بکەم... سەرتیپیی ئەمڕۆیش هەر تەقەکردن نییە...

دیار بوو باوکم حەزی بەم گاڵتەیەی من نەدەکرد، زۆر شانازی بە من و مەحمودی برامەوە دەکرد، خۆشی دەویستین، بەڵام جۆری خۆشەویستییەکەی جیاواز بوو... ئای بۆ ئەو ڕۆژەی پێشمەرگەیێک پێی گوتین:

- خۆتان خۆش... باوکتان شەهید بوو!

پێم وا بوو هەر لەگەڵ تەواوبوونی قسەکانی پێشمەرگەکە، هەرچی کۆڵەکەی بوونم هەبوو، هەر هەمووی داتەپین، تاسە بردمیەوە، بەرچاوم تاریک بوو، گێژ و کاس بووم، چ ترسی شەقازللەی چ کەسێکم نەبوو،

تێر تێر گریام... چ تاقەتی ئەوەم نەبوو لە پێشمەرگەکە بپرسم، کەی؟ چۆن؟

مەحمودی برام بە لاڵەپەتێیانەوە پرسی:

- کەی؟

پێشمەرگەکە بە قورگی پڕ گریانەوە بە مەحموودی گوت:

- دوێنێ بەیانی.

- چۆن، لە کوێ؟

- خۆی و پێشمەرگە دەکەونە نێو کەمینەوە، دووانیان دەست بەجێ شەهید دەبن، باوکیشتان بریندار دەبێت. بەڵام برینەکەی وا دیارە سووک بووە، لەگەڵ پێشمەرگەکەی دیدا، کە لە تەمەنی خۆیدا بوو و ئێوەیش دەیناسن و ناوی (شێخە شەل) بوو، دێنە دەست، تا بەتەواوەتی دەوریان دەگرن، شەڕیان کرد، مغاویرێک دەکوژن و دووانی دیش بریندار دەکەن، هێرشیان بۆ دەهێنن، شێخە شەلیش شەهید دەبێت، پاشان وەک لە شارەوە خەبەرمان پێگەیشت، باوکتان فیشەکی پێ نامێنێت، بە دەمانچەکەی فیشەکێک بە خۆیەوە دەنێت... مغاویرەکان هەر چوار تەرمی پێشمەرگەکان بە سەیارە ڕادەکێشن، دەیانبەنە مەعەسکەرەکەیان، لەوێدا دەبابەیان بەسەردا دێنن و بە بەنزینیش دەیانسووتێنن!

***

ئەو ڕۆژەی هەواڵی شەهیدبوونی باوکمیان دامێ، یەکێک بوو لەو ڕۆژە درێژانەی کە توانای ئەوەم نەبوو ژیانی تیا بەسەر ببەم، تەمەنی ئەو ڕۆژە لەلای من ئەوەندە درێژ بوو، یەکە-یەکەی یادەکانی تەمەنم، وەک

ئەوەی ڕووداوەکانی ئەو تەمەنەم خۆیان دووبارە بکەنەوە، ئاوها بە بەرچاوما تێدەپەڕین... پێم وایە تاڵی و تفتییەکانی ژیانی باوکم، لە ڕۆژی مەرگیا هەموو بووە مژەغەمێکی خەست و لەگەڵ نەمانیدا، دەرخواردی من درا، بۆ یەکەم جار - بۆ ئەوەی پاکانە بۆ ڕەفتارەکانی باوکم بێنمەوە - خۆمم خستە جێی ئەو، وردە پرسیاری هەندێک بەجێیم لە خۆم کرد، بە سەراپای ڕووداوەکانی تەمەنی باوکما هاتمەوە، بۆ هەندێک لە ڕەفتارەکانی، پاکانەی ڕێک و بەجێیم بۆ دەهێنایەوە، جارجارێکیش لە بەرخۆمەوە دەمگوت:

(منیش لە باتی ئەوبام، لەو کات و شوێنەی ئەودا، هەر هەمان ئەو ڕەفتارانەم دەکرد، کە باوکم کردوونی، تەنها یەک ڕەفتاری نەبێت، ئەویش تا لە ژیاندا بوو، کەمتر ئەو ڕەفتارەیم وەبیری خۆم دەهێنایەوە، کەمتریش ڕووبەڕوو و ڕاستەوڕاست لە خۆمم دەپرسی، تا لە سەرئەنجامدا حوکم لەسەر ئەو ڕەفتارەی باوکم بدەم... ڕەفتارەکەیشی گەلێک نهێنیئامێز بوو، تا ئێستایش وەک گرێیەک لە دڵما مایەوە، دەرفەتی ئەوەم بۆ نەڕەخسا پێ بە جەرگی خۆما بنێم، بێ شەرم و ترس، پرسیاری لێ بکەم، تا لە دەمی خۆیەوە وەڵامێک ببیستم، داخەکەم باوکم نەما، پرسیارەکەیش بووە گرێکوێرەیەکی سەر دڵم... نەمزانی بۆچی باوکم دەریکردم، لەسەر چی بوو، تۆ بڵێی، ئەو پیاوە خاوەن ئەو هەموو تەجرەبە تێروتەسەلە ئینسانییەی خۆی، ئەوەندە بێڕەحم و ویژدان بووبێت؟ یا شتێکی دیی ئەوتۆی قورس و گرنگ، پەیوەست بە ڕەوشت و بۆچوونی خۆی، ئەم کارەی پێ کردبێت؟ من شیرەخۆرە بووم کە دەرکرام، پێم وا نییە چ گوناهێکم هەبووبێ).

گرێیەکیش نیشتبووە سەر دڵ و دەروونمەوە، ببووە مایەی بەدگومانیم، گەلێک جار بە چپەوە ئەم وشەیەی دەدایە بای گوێما،

تۆ بڵێی هەر لەگەڵ لەدایکبوونم، حوکمی ئەوەم بەسەردا چەسپا، کە دەبێت لەبری گوناهی کەسانی دی، من باج بدەم؟ نازانم ئەگەر وا بووبێت، دیارە میراتگری گوناهێکی گەورەی نادیارم، بەبێدەنگی، تاڵاوی ئەو گوناهەی لەنێو خوێنمدا، هەر هاتوچۆ دەکات، چاوەڕێی هەل و دەرفەتێکە، تا بێئیرادەی خۆم، خوێنم جێ بێڵێ و سەر هەڵبدات و بێتە دەرێ، حەقیقەتی ئەساسیم بسەلمێنێت، سەرئەنجامیش ببێتە ئەستونگەی ڕەفتاری داهاتووم!

نازانم بۆچ ئەو ڕۆژە - ڕۆژی مەرگی باوکم - گومانم لە دایکم پەیدا کرد... تۆ بڵێی دایکم داوێنپیس بووبێ؟

خۆ چ کەسێکی دێیەکەمان، بە گەورە و بچووکەوە، لە ژن و پیاوەوە، چ قسەو ئیشارەتێکی ئەوتۆیان نەبووە، تا من ئەم گومانەم لا دروست بێت... دایکم یەکێک بووە لەو ئافرەتە بێناو و بێدەنگانەی، کە تەنها ئەرکی بۆشایی پڕکردنەوەیان کەوتبووە ئەستۆ و هیچی تر! چ جارێک لە چ کەسێک باسی شتێکی دایکی خۆمم نەبیست، ناوەکەیم دەزانی و بەس، ئایشێی میرزا ڕەحیم، ئەوەندەشم دەزانی، کە بیست ساڵ لە باوکم منداڵتر بووە، لەبری خوێن و بە زەبری خەنجەر دەیدەن بە باوکم... مردنەکەیشی وەک ژیانەکەی بووە، بیرەوەری و ناو و هەموو شتێک پەیوەست بەو بووبێت، هەر هەموو ئەو شتانە نەمان، تەنانەت سێبەری هیچ شتێک لە دوای خۆیەوە جێ ناهێڵێت. دیارە هەر ئەوەندەی زانیوە، ژیانە کولەمەرگییەکەی خۆی پێ بباتە سەر، بایی ئەوەندەش قسەی زانیوە بڵێت (ئا) یا (نا)، پێم وا نییە چ حسابێکی بۆ کرابێ، لەگەڵ ئەوەی ئەم ژیانەی دایکم دەزانم، کەچی گومانیش ڕێی بۆ دەروونم خۆش کردووە.

گریمـان دایکـم داوێنپیـس بووبێت - کـە ئەمەیـان هەرگیـز بـە عەقڵـی ساتەکانی هۆشـیاری و بێدەنگیمـەوە ناچێت - گوناهـی مـن چـی بـووە؟

زۆرم پێ سـەیر بوو، چ جارێک دایکم، بە خەونیش نەدەهاتە بەرچاوم، ڕاسـتتر شـێوەی ڕووخسـاریم نەدەناسـییەوە، بـەڵام ئـەو ڕۆژە - ڕۆژی مەرگی باوکم - ڕووخسـارێکی زەینکردی خۆم، بەر دیدەی بـەر نـەدەدام، ڕووبەڕووی وەسـتابووم، هەزار و یەک پرسیارم لەو ڕووخسـارە دەکرد... ئافرەتێکـی ڕەنگـزەردی شـرپۆش، وەک ئـاژەڵ سـەیرکراو، فرۆشـراو، لـە بـری خوێـن بـەرەو دۆزەخـی شـووکردنی نەریتـی بـاو، کەرئاسـا ڕەشـمە لێکراو، بێدەنـگ، سـەرکوێر، ژێـر چەپۆک، دەبێت چ وەڵامێکم بداتـەوە؟

ئـەو ڕۆژە هەنـد بەتوڕەییـەوە دەمڕوانیـە ئـەو ڕووخسـارە زەنکـردەی خۆم - کـە گوایـە ڕووخسـاری دایکمـە - ئاگری کەرایەتـی لـە چاوانمـەوە دەردەپـەڕی... دایکـی نەمـاوی بێدەنـگ چ وەڵامێکـم بداتـەوە؟

باوکـم هـەچ ڕەفتارێکـی کردبوو، تـا ڕادەیێـک پاکانـەم بـۆ دەهێنایـەوە، تەنهـا لـە مەسـەلەی مـن و دایکـم نەبێت، کـە هـەر وەبیـرم دەهاتـەوە، هـەر ئـەوە بـوو لـە داخانـا نەدەتەقیـم... لـە خۆمـم پرسـی:

- گـەر حـەز لـە کچێـک بکـەم، ئەویـش دڵـی بـە منـەوە بێت، وەک دەسـتووری کوردەواری چەند جارێک بچمـە داخوازیی، بیانووی گـەورەم پـێ بگـرن، چ دەکـەم؟

ئەڵبەتـە هەڵیدەگرم... باوکیشـم هـەر وای کـرد، کەچـی لـە دوو سـەرەوە ئەنگاوتیـان و جەرگیـان ئـاودا، یەکـەم دڵخوازەکەیـان کوشـت، ئەمیشـیان برینـدار کـرد، دووهەمیـش بەدناویـان کـرد.

گـەر لەسـەر کەرێـک، کەسـێکم لـێ بکـوژن، وەک یاسـای عەشـایەر و

لادێنشین، گەر کوێرە خوێنەوارییێکم هەبێت، کاردانەوەی من چ دەبێت؟ ئەڵبەتە تۆڵە دەسێنمەوە، باوکیشم هەر وایکرد... دووبارە باوکم لە دوو سەرەوە تووشی نەهامەتی هات، یەکەم، خۆشەویستانی خۆی کوژران، دووهەم، خستیانە باخەڵی ئافرەتێکەوە، کە ڕەنگە بە خەونیش نەهاتبێتە بەر چاوی، لەگەڵ هەموو جووتبوونێکیا، خوێن و تارمایی کەسی کوژراو تێکەڵ بە لەزەتی ببن... دەشێت لەو کاتەدا دەنگی خوێنەکەی بەچرپەوە پێی بڵێت: (ئەمە بوو نرخی من) پاشانیش لەم نالەزەتی بێزەدا (منێک) بێتە بەرهەم! دەبێت چ بەرهەمێک بم؟ تف بەرەو کوێ هەڵبدەم؟ بەرەو ژوور؟ دەکەوێتە سەر ناوچاوانی کێ؟ بەرەو خوار؟ دامێنی کێ دەگرێت؟ گریمان باوکم بە پێی ئەو هەموو حیساباتە عەشایەرییانە، هەندێک حەقی هەبووبێ لەگەڵ دایکما سارد و کەمدوو بووبێت، بەلام لەگەڵ مندا بۆ؟ تۆ بڵێی باوکم دەمارێکی شێتانەیشی تیا نەبووبێت؟ یا نهێنییێکی گەورەی ئەوتۆ لە گۆڕێدا بووبێت و تا مردنیش نەیدرکاندبێت و لەگەڵ خۆیدا بەرەو خاکی بردبێت؟

هیچ کات ئەوەندەی ئەو ڕۆژە لە یەک کات و شوێندا بەزەیی و ڕقم بۆ باوکم تێکەڵ نەبووبوو، نەگەیشتمە چ قەناعەتێک، زیاتر شتەکانم لا ئاڵۆزتر بوو، زیاتر ڕەشبین و بەرچاوڵێلتر بووم... تەنانەت گومانم لە خۆم، لە بوونی خۆم، لە دەوروبەرم پەیدا کرد، گومانێک، سێبەرئاسا لەگەڵ هەموو قسە و ڕەفتارێکما، ئاوێتەی جۆرە سڵ و باوەڕنەکردنێکی ئەوتۆ بوو، کەم شتی ڕاستم بە ڕاست دەزانی، زیاتر تەمی گومانم دەئالاندە قەد شتەکانەوە.

(حەمە شێت)ی خاڵۆم وەک باسی دەکەن، هەر لە منداڵییەوە شێتۆکە بوو، بشێت شێتایەتی نەخۆشییەکی ویراسی خانەوادەکەیان نەبووبێت، دایکیشم گیرۆدەی هەمان نەخۆشی نەبووبێت، باوکیشم بە ئازاری ئەو

نەخۆشییەی دایکم تلابێتەوە، منیشی هەر بەهەمان ڕەچەڵەک لە قەڵەم دابێت... گەر واش بووبێت، خۆ ئەمە نابێتە مایەی ئەوەی منی شیرەخۆرە دەرکرێم... لەم دواییەدا باوکمم گەلێک خۆش دەویست، شانازیم پێوە دەکرد، بەڵام ئێستا ناتوانم قەناعەت بە خۆم بێنم و بڵێم: بە دڵ لەو کارەی دەبوورم... نەخێر، هەرگیز لێی نابوورم، بە هیچ جۆرێکیش گەردنی ئازاد ناکەم... باوکم کە لە ژیاندا بوو، بۆشایی ئەم پرسیارانەی بۆ پڕ کردبوومەوە، وەنەبێ هەندێک جار تارمایی ئەم پرسیارانە بە بەر دیدە و مێشکما گوزەری نەکردبێت، بەڵام لەگەڵ نەمانی باوکما، ئەم بۆشاییە بەرینتربوو، بە شێوەیێک ئەم بۆشاییە دەمی داچەقاند، سەراپای بیر و بۆچوون و پرسیارەکانی تەمەنی هەڵدەلووشی و بێ ئەوەی وەڵامێکی بەجێ وەدەست بێنم و ئەم دڵە دێوانەیەم داساکێنێت، ساتەوەختێک ئارام و ڕوو بکاتە ئەم ژیانە دۆزەخەم...

پێم وابوو، هەموو کەسێک، ئەو کەسانەی ژیانی ڕۆژانەم لەگەڵدا بەسەر دەبەن، لە مزگەوت و تەوزیع، لە پەنا بەرد و نێو بەفر و ئەشکەوت، لە حەرەسیات و کەمین، هەموو ئەو هاوڕێیانەم هەست بەو گومانەی من دەکەن... هەر چەندە هەوڵم دەدا ڕێ لەو گومانە ببڕم، کەچی ڕووخسارە زەینکردەکەی خۆم - کە گوایە دایکمە - بەبێدەنگییەوە دەیڕوانییە ڕەفتار و قسەم، هەر بەبێدەنگییەوە ئەزیەتێکی ئەوتۆی دەدام، ڕۆحی ژانگرتوومی دەهەژاند... گەلێک جار لە ئاستی بێدەنگی ئەو ڕووخسارەدا سەرزەنشتی خۆمم دەکرد. (نابەجێیە گومان لە دایکی خۆت بکەیت).

هەوڵم دەدا دڵی خۆم بەوە بدەمەوە، کە ژیانی لادێ و دنیای لادێ، هەند بەرین نییە شتی تیا ون بێت، لە دێدا، بچووکترین ڕووداوێ، پاش ڕۆژێ دووان، ئەمسەر و ئەوسەری دێیەکانی دەوروبەریش دەیکەنە

بنێشتەخۆشـە... خـۆ هـەر لـە دێیەکـەی خۆمانـدا، دەگێڕنـەوە:

(فاتەیـان سـواری کـەر کـرد، هەرچـی خـۆڵ و دۆی ئـەو نـاوە هەبـوو هەموویـان کـردە سـەری... ڕەعنـا بـە جۆرێـک لـە دێـدا دەرکـرا... هـەر نەبێتـەوە، پاشـانیش لـووت و گوێیـان کـرد... ببـووە (پـەن).

دڵـم هـەر ئـاوی نەدەخـواردەوە... یا دەبـوو پڕ بـە دەم تـف لـە قەبر و ڕەفتـاری باوکـم بکـەم، یـا بـە هـەر جۆرێـک بێـت پاکانـە لەسـەر حیسـابی بەدناوکردنـی کەسـێکی دی بـۆ باوکـم بێنمـەوە... ئـەم دوو شـتە هەنـد قـورس بـوون، بەرداشئاسـا مـن لـە نێوانـی ئـەم دوو شـتەدا، خـەون و پرسـیار و هیواکانـم دەهـاڕدران... لـەرز دایدەگرتـم، کـە جـار جـار زیـاد لـە پێویسـت بـەرەو بنـج و بناوانـی ئـەم هەسـتەم دەچـووم... سـەرئەنجام ناچـار دەبـووم، تـف لـە بیرکرنـەوەی بەدگومانـی خـۆم بکـەم... جـا کـەی (تـف) دەتوانێـت ئاگـری دۆزەخـی دەروونـم بکوژێنێتـەوە، کـەی تـف ئاگـر دەکوژێنێتـەوە... پێـم وابـوو تفەکـەی مـن بەنزیـن ئاسـا ئاگـری دەروونمـی زیاتـر دەگەشـاندەوە...

ئێستا، لەم وەزع و حاڵەمدا، ناتوانم ڕادەی ڕقی ئەوسـام دەرببڕم... ئیتر نازانـم پاش ئـەو ڕۆژە چەند ڕۆژێک بـوو، ماتەمینییەکی ئەوتۆ دایگرتبووم، چ وشـەیێکی دەروونـی پەنگاوەم، ڕێـی سـەربەرزکردنەوەی نەبـوو... لەگـەڵ ئـەو کەیلییەمـدا، خۆشـەویسـتییەکی پتەوتـر لەنێـوان مـن و مەحمـودی برامـدا گەشـەی دەسـەند... بـێ یەکـدی ئیدارەمـان نەدەکـرد، تەنانـەت لـە تەوزیعبوونیشـدا بـۆ یـەک مـاڵ دەچووین، گەلێک جـار لـە نۆبـە حەراسـەتی منـدا، ئەویـش بێدار دەبـوو، منیـش لـە حەراسـەتی ئـەودا، ئێشـکم دەگـرت... ئەگەرچـی ئـەو بەتەمـەن لـە مـن منداڵتـر بـوو، بـەڵام لـە مـن زیرەکتـر بـوو، عەشـایەر و پێشـمەرگە، گـەورە و بچـووک، خۆشـیان دەویسـت، گوێیـان لـێ

دەگرت، ئەو لە من زیاتر خۆی هان دەدا، شەونخونی دەچێژت، بێ سڵ و شەرمکردن بە سۆراغ و پرس، خۆی وا لێ کرد بە جوانی لەو کتێبانە حاڵی دەبوو - کە دەیخوێندەوە، هەمیشە لەنێو جانتایەکی تایبەتی چەند کتێبێکی بەبەهای پێ بوو - پاش خوێندنەوەی هەر کتێبێک، بۆی باس دەکردین، زۆر شتی قورسی بۆ شی دەکردینەوە، منیش هەر کتێبێکم دەسکەوتبا - لەو بابەتە کتێبانەی مەحمودی برام حەزی لێ دەکرد - یەکسەر بەرگم تێدەگرت و بۆم دەبرد.

من لە مەحمود زیاتر، پێشمەرگەکانیش لە هەردووکمان بەپەلەتر بوون، تا مەحمود بیخوێنێتەوە و کاکڵەکەمیان بۆ باس بکات... هەر کە پاش تەوزیع و نانخواردن بۆ مزگەوت دەگەڕاینەوە، زۆربەی پێشمەرگەکان حەزیان دەکرد، نۆبەی حەراسەتەکەیان لە سەعات یانزە و دوانزە بەلاوە بێت، نەوەک لەو موناقەشەیە بێبەش بن، کە مەحمود سەری باسەکەی دەگرتە دەست و لەگەڵ کتێبەکەی دەستیا دەیگونجاند، ئیدی موناقەشە، چ بە پرسیار و چ بە شیکردنەوە و ڕەخنە دادەمەزرا، گەلێک پێشمەرگەی نەخوێندەواری تیپەکەی ئێمە، بە عەشقەوە فێرە ئەلف و بێی خوێنەواری ببوون، هەندێکیان بەئاسانی نامەکانی خۆیان دەنووسی، لە موناقەشەدا زۆربەی پێشمەرگەکانی تیپەکەمان دەستووری تایبەتی موناقەشەیان ڕەچاو دەکرد و دەیانگوت (ئەوەی لە موناقەشەدا تووڕە بێت، یا دەنگ بەرز بکاتەوە، یا نۆبەبڕی بکات یا قسەی یەکێکی دی ببڕێت، ئەوا ئەو کەسە کەڵکی موناقەشەی نییە...) وەک ئەوەی پێشمەرگەکان - سەرباری هەموو کاروبارێکی خۆیان - لە دانشگا بن، ئاوها لە مزگەوت و پەنا بەرد و ئەشکەوتا، خۆیان فێر دەکرد، چەن جارێک مەحمودی برام بە پێشمەرگەکانی دەگوت:

- بەڵێ، ئەم ژیانەی ئێمە دانشگایە... ئەم برسێتی و دەربەدەرییەمان

ئەلف و بێی وانەکانی سەربەستییە... ئێمە لەم وەزع و حاڵەماندا چێژ لە هەردوو لایەنی وانەکان وەردەگرین، یەکەمیان، وەک پیت و وشە، زاخاوی مێشک و پەرە بە ڕۆشنبیری خۆمان دەدەین، دووهەمیش، ناوەڕۆک و مانای وشەکان بە قەوارە حەقییەکە، دەبێتە خوێنی ڕەفتارمان... سەد ئافەرین بۆ ئەو کەڵەپیاوە نیشتمانپەروەرە و نەتەوەپەرستەی ئەڵمانیا، کە فەرموویەتی: کۆیلایەتی چاکترین قوتابخانەیە، ئا لەوێدا، گەل فێری وانەکانی سەربەستی دەبێت.

ئیدی من و مەحمود و پێشمەرگەکان، جۆرە هاوڕێیەتیەکی بەتینی ئەوتۆ بە یەکەوەی بەستبووین، ڕۆژ بە ڕۆژیش پتەوتر دەبوو.

***

پێری، بەپەلە مەحمودیان بەرەو سەرکردایەتی بانگ کرد، دوێنێ گەڕایەوە، هەر زوو هەموو پێشمەرگەکانی کۆ کردەوە، لە پێشدا کۆبوونەوەی لەگەڵ ئامرکەرتەکاندا کرد، پاش کۆبوونەوەکە، چووە سەر بەرزییەکەوە، ڕووی دەمی لە هەموو پێشمەرگەکان کرد:

- براینە، ئیشی ئەمجارەمان گەلێک سەختە... پاشان ئامرکەرتەکان نەخشەی دیاریکراوتان بۆ ڕوون دەکەنەوە، ئەڵبەتە ئەوەش دەزانم مژدەیەکی مەزنە بۆ ئێوە، ئەویش پەیوەستە بە ئومێد و هیواتانەوە، پێم وایە دەزانن چیم مەبەستە و دەبێت چیش بکەین، دڵنیام زۆرتان پێ خۆشە، کارێک بکەین، لە دنیا و لە دوژمن بگەیێنین، کە نەک تەنها هەین و هیچ هێزێ نییە لەناومان ببات، بەڵکوو دەبێ ئەو خاکەی داگیرکەر تەراتێنی لەسەر دەکات، لێی بکەین بە دۆزەخ و ناوچەیێکی دیاریکراو لە گلاوی و پۆخڵییان پاک بکەینەوە... جا لەبەر ئەوە، بەپێی تەجرەبەی یەکدی ناسین و هاوڕێیەتی و دڵنیاییم لە دڵسۆزیتان، بێپەروا هەموو

شتێکی پێویستتان بۆ باس دەکەم.

ئەویش شۆڕش بە نیازی هەنگاوی گەورە و قورس، بە نیازی گۆڕینی نەخشەی شەڕ و دارشتنی بناغەی نوێ بۆ شەڕی پارتیزانی، ئەوا لە شۆڕشی نوێماندا بۆ یەکەم جار دەستی پێ دەکەین، ئەویش چەند تیپێک، بەپێی نەخشەیێکی مەحکەم، لە یەک کات و شوێندا هێرش دەبەین... شوێنێکی دیاریکراویان بۆ تیپەکەی ئێمە داناوە، لەبەر ئەوەی من خۆم خەڵکی ئەم ناوچەیەم، بست بە بستی شارەزام، ئەو هەشت ڕەبیەی دەوری گوندە خاپوورکراوەکەی ئەودیوی، ئەم زنجیرە چیایەی بەرانبەرمانیان پێ سپاردووین... جا هەر ئامرکەرتە دێ و شوێنی خۆی، ڕێی کشانەوە، جێی کۆبوونەوەی پاش هێرش و ڕەبیەی خۆی بۆ دیاری کراوە، دەستەکانی هجوم دەستنیشان کراون، نارنجۆکی پێویست و سەعاتی سفر و کەلیمەی سر لە کاتی خۆیدا دابەش دەکرێت و دەگوترێت... هەروەها دەلیل و فیشەک و پێویستییەکانی دیش ئامادە کراون، ئەڵبەتە بە نیسبەت تیپەکانی دیشەوە، وەک ئێمە، هەموو شتێکیان بۆ دیاری کراوە، گەلێک مەفرەزە و کەرتی دیش، بە درێژایی شەست کیلۆمەتر لە ئەملا و ئەولای جادەی قیردا کەمین دادەنێن و ئامادەن... هەموو ئیحتیاتێکی پێویست وەرگیراوە... دوا قسەم ئەوەیە، پاش نانخواردنی ئێواریّ، هەر پێشمەرگەیە بایی سێ ژەم نان لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێت، ئیدی پێویست ناکات بڵێم، ئەمشەو چ کەسێک بە چ لایەکدا نەچێت...

***

لە کوێرە گوندێکی خاپوور، پێشمەرگە هەندێک ماڵی تیادا ئاوەدان کردبۆوە، لەوێدا بووین کاتێ مەحموودی برام ئەم قسەی کرد، هەر کە

ئەو قسەکانی تەواو کرد، شادییێکی زۆر سەیر نیشتە سەر ڕووخساری سەراپای پێشمەرگەکان، زەردەخەنەی گەش، بەختەوەرییێکی بێدەنگ تێکەڵی چەکەکانیشیان ببوو، کە زۆربەیان بێئیرادە بەنەرمییەوە دەستیان بەسەر چەکەکانیاندا دەهێنا! منیش یەکە-یەکە سەرنجی پێشمەرگەکانم دەدا، پرسیارێکی بێدەنگی من، خەرمانە ئاسا بەسەر سەری یەک بە یەکی پێشمەرگەکاندا لەنگەری دەگرت:

(ئەمجارەیان کام یەک لە ئێمە شەهید دەبێت).

چاوم بەسەر دوا کەسدا گێڕا... ئەوە هۆشیارە، تەمەنی بیست ساڵە و دە پارچە زیاتر بە لەشیەوەیە، گەلێک ئازا و چاونەترس و چاپووکە، هەمیشە خۆی بۆ دەستەی هجوم هەڵدەبژێرێت، تاقانەی ماڵە، گەلێک بێدەربەستە، هەر جارەی کە بریندار دەبوو، لە کشانەوە و ئیسراحەتدا پێیان دەزانی، باوکی دەوڵەمەندە و گەلێک جار پارەی بۆ دەنێرێت، هۆشیاریش هەندێک جار بەشێک لە پارەکەی دابەش دەکاتە سەر پێشمەرگەکانی هاوڕێی...

تۆ بڵێی ئەم جارە و لەم کارە قورسەماندا شەهید نەبێت؟ ئەویش سیروانە، هەڵەشە و سەرەڕۆیە، هەر مل دەنێت و سەرچڵی دەکات، گەلێک جار نەخشەی تێکداوە و لە خۆڕا، بە تاقەنەفەری چووەتە سەر ڕەبیەکان، یەک - دوو تەقەی کردووە و کشاوەتەوە، ئیدی ڕەبیەکانیش، تا بەرەبەیان بە هەموو جۆرە چەکێک کوێرانە تەقەیان کردووە. گەلێک جار لەسەر ئەم کارانەی موحاسەبە کراوە و هەموو جارێکیش کە لێیان دەپرسی بۆ وات کردووە، دەیگوت حەزم لە بێدەنگی نییە، ئەم تەقە و گرم و هۆڕە بوونی شۆڕشگێڕیم دەسەلمێنێت، لە لایێکی دییەوە بوونی داگیرکەریی (ئەوان) دەخاتە ڕوو، ئەم تەقانە ڕقم دەمەزەرد دەکەنەوە...

هەند سەرەڕۆ بوو، دابینکردنی گەلێک زەحمەت بوو، بەدزییەوە دەچووە یەکێک لە شارەکانەوە، چالاکییەکی ئەوتۆی دەکرد، پێشمەرگاکانی ناچار دەکرد، بەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازی بکەن... سیروان وەک لە ڕەفتاریدا توونـدڕەو بوو، لە گرفتاریشیا توونـدڕەو و قسەلەڕوو و بەجوورئەت بوو، چەند جارێک گوێم لێ بووە بە مەحمودی برامی و گوتووە:

- کوڕی باوکم، ئەگەر پێشمەرگەی وەکوو من نەبێت، تۆ سەرتیپی چیت؟ نەک تۆ، بەڵکوو ئەگەر ئێمەی پێشمەرگە نەبین، سەرکردە و مەرکردە چین؟ تۆ و ئەوان بە ئێمەوە هەن، گەر ئێمە نەبین، پێم ناڵێیت ئێوە چین؟ ئیتر پێویست ناکات وا بە ڕەقییەوە موحاسەبەمان بکەن... زۆر شت هەن من نایانزانم و ناشمەوێت فێریان ببم، بە هیچ جۆرێک نامەوێت وێنەیەکی ماکیاجکراوی دوژمنم بۆ بخەنە ڕوو، لە عەقڵی مندا دوژمن دوژمنە و دەبێت بە خوێنی خۆی شوێن پێیەکانی لەسەر ئەم ئەرزە داگیرکراوەمدا بسڕمەوە... بۆیە هەر فرسەتێکم دەست بکەوێت بە ئاستەم لێی لانادەم، تەنانەت تەقە لە سێبەرەکانیشیان دەکەم... گەر وا نەکەم، زۆرم بێز لە خۆ دەبێتەوە... بۆیە پێشمەرگەم، تا زەبر بنوێنم، دەنا پێشمەرگایەتی بێ زەبر نواندن دەبێتە چاوشارکێ و یاری پشیلە و مشک... من گەمە ناکەم، من کوردم.

سیروان بەقەد ئەوەی قسەی ڕەق بوو، بەڵام هەند شانازی بە نەتەوەکەیەوە دەکرد، پیاوی ناچار دەکرد گوێ لە قسەکانی بگرێت، بە تایبەتی کە بەزەوق دەبوو و دەیگوت:

- تەنها یەک شت دەزانم، ئەو شتەیش حەقی داوە بە ڕەفتارەکانم، ئەویش ئەوەیە، کوردم، زوڵم لێکراو و دەربەدەرکراو و چەوساوەم - هەر تەنها لەبەر ئەوەی کە کوردم - بۆیە خۆم بە ناحەق نازانم، گەر

زاڵمی خۆم بە گون هەڵبواسم، بیکوژم، ماڵی بەسەردا وێران بکەم، ئەرز و ئاسمانی لێ بکەم بە ئاگر، تا لەسەر زەویمدا بن و داگیرم بکەن، مریشکەکانیشیان دەکوژم... خوێندنم تەواو نەکردووە، زۆریش دنیادیدە نیم و لەناو ئێوەدا، فێری هەندێک قسەی زل بووم، پێم وایە هەرچی دین و ئایینێک هەیە، هەرچی فکر و فەلسەفە هەیە، تەنانەت خواش ئەم کارەی من بە خوێنڕێژی نازانێت، بە عیبادەتی ڕاستەقینەی ڕێی تێکۆشانی ئینسانی و بۆ ڕزگارکردنی ئینسان ئەم کارەم لە قەڵەم دەدەن، تا هەناسەشم تیا مابێت، هەرگیز بەزەییم بە داگیرکەر و زاڵمدا نایێتەوە، ئێوەش بە چ چاوێکەوە سەیرم دەکەن، ئەوا کەیفی خۆتانە...

گەلێک جاریش (سیروان)م دەبینی زۆر بە سۆز و بەزەییەوە لەگەڵ دیلە داگیرکەرەکاندا، کە سیروان ناوی لێنابوون ( مقاشی دارینی دەستی داگیرکەری گەورەتر)، ڕەفتاری دەکرد...

هەر کەسێکش بە لاچاو سەیری سیروانی کردبا، ئەویش وەک ئەوەی لە فیتی خۆی تێبگات، یەکسەر وەلامی سەرنجەکەی دەدایەوە:

- برا، ئەم ژیانەی ئێمە زانکۆیە... دەرسێک دەخوێنین، بە داخەوەم زانکۆ ڕاستەقینەکان لەم دەرسە عەمەلییە بێبەرین!

(سیروان) دوو خوشکی عازەب و باوک و پیرە دایک و برایەکی چکۆلەی لە شاردا جێ هێشتبوو، ناخۆشترین قسە بەلای سیروانەوە ئەوە بوو، کە یەکێک لێی پرسیبا، ئەرێ ئێوە کێ کاسبیتان بۆ دەکات و بە چیی دەژین؟

زۆر بەدەمارگیرییەوە وەلامی دەدایەوە:

- بە گوو... بە بەرد و بە هەوا دەژین... گەدەی فەقیر بەرداشە

و هەمـوو شـتێک دەهارێت... دایکم نانەوایـی مـاڵان دەکات، خوشـکەکانم خەیاتی دەکەن، باوکیشم حەماڵە و برا چکۆلەکەشم شاگردی چاییچییە... ڕەنگە هەندێک ئەحمەق و گەوج بڵێن: چاکە، بۆچی خزمەتی ماڵ و کەسوکارت ناکەیت، لەم ڕۆژەدا ئەوان زیاتر پێویستیان بە تۆیە...

ئەوانەی کە دەڵێن، یا نیازیان وایە وا بڵێن، هەر تەنها ئەحمەق نین، بەڵکوو بەرانبەر بە میللەت و خۆشیان بێئەخلاقن... بۆ چ ماڵە کوردێکی بەشەرەف و تێکۆشەر هەیە - لە مەیداندا بن - وەزعیان وەکو ئێمە نەبێت. بۆ هەر دایک و باوکی من برسی و کوێرەوەرن، یا سەراپای بەشەرەفانی میللەتەکەم وەک ئێمەن.

گەلێک جار، کە زیاد لە پێویست توورە دەبوو، دەیگوت:

- گەر خوشکەکانم گانیش بدەن، لەو ئافرەتە(تیرانە) شەریفترن، کە لە ئاستی داگیرکەر بێدەنگن و بە ڕوویانا پێدەکەنن، دەست بە دەرپێکانی خۆیانەوە دەگرن، نەک ڕەشەبا و زریانی تێکۆشان و لەخۆبوردوون بیبات... گەر سبەینێ لە نێوانی دوو کاردا خۆم ببینمەوە، پێتان وایە چ دەکەم. گەر باوک و دایک و برا و خوشکەکانم لە برسانا بمرن، منیش توانای ئەوەم هەبێت - پاش ئەوەی تەسلیم ببمەوە - نانیان بۆ پەیدا بکەم و لە مەرگی حەتمی ڕزگاریان کەم... لەملاشەوە میللەتەکەم وەکوو ئێستا پێویستی بە پەنجەی نەترس و چاوی زیت هەبێت، بۆ ترازاندنی پەلەپیتکە و ڕاگرتنی لەشی داگیرکەر لەنێو سێرەی تفەنگ، ئەمە هەردووکی بۆ من لە یەک کاتدا بێت، من، بەڵێ من، گەر پەنجەم بۆ ترازاندنی پەلەپیتکە نەخەمە کار و چاوم نەخەمە سەر سێرە، بە خوێنی لەشی بەرانبەری نێو سێرە چاوم نەڕێژم، خۆم، بەڵێ خۆم بە ئینسان نازانم... جا تف لەو ژیانە نەبێت مرۆڤ تیایدا بژێت و ئینسان

نەبێت! گەلێک سەربەرزییە بە بێکەسی و برسیەتی لەنێو چیا و چۆڵدا بمێنیتەوە و وەکوو ئینسان ژیان بگوزەرێنێت... هەر کە هەستم کرد ئینسانم، هەست دەکەم سەربەستم، من سەربەستم، ئینسانی خۆم بە هیچ شتێکی ئەم دنیایە ناگۆڕمەوە... ژیانی ئینسانیم ئەوەم بۆ دەچەسپێنێت، کە سەربەستم، لە هەڵبژاردن، بڕیاردان، بەرپرسیاری... گەر ئەم سێ کۆڵەکەیەم لێبکەنەوە، ئیدی چ پاکانەیێک بۆ ژیانم نامێنێت...

(سیروان) یەکێک بوو لەو کەسانەی کە خۆی، خۆی بەخێوکردبوو، کە قوتابی بوو، پاش هەموو پشوویەکی سەری ساڵ، کرێکاری دەکرد، یارمەتی کەسوکاری دەدا، گەلێک کتێبی - پێویستی - بۆ خۆی دەکڕی، بەوردی تاقیکردنەوەکانی ژێردەستە و چەوساوە و تێکۆشانەکانیانی دەخوێندەوە... هەر کە شۆڕشی نوێ سەری هەڵدا، خۆی وەتەنی، بە ئەوپەڕی ڕێزی نوشست دیدەییەوە، شۆڕشێکی شەهیدکراو بە ئاشبەتاڵێکی قێزەون سپارد - لەگەڵ ئامۆزاییکیدا بوو بە پێشمەرگە، پاش یەک - دوو ساڵێ - کە تەنها کەڵەمێردانی میللەت تەحەمولی دەکەن - ئامۆزاکەی لە شەڕێکدا بەردەکەوێ، گوللەیێک بەر سنگی دەکەوێت، هەر پاش شەڕەکە سەری ئامۆزاکەی لەسەر دەستی سیرواندا دەبێت، گیان دەسپێرێت و شەهید دەبێت...

شەهیدبوونی ئامۆزاکەی، بە جۆرێ کاری تێکرد، زیاتر ڕقئەستوورتری کرد، فێری ئەوەی کرد چ ترسێک ڕێ بۆ دەروونی خۆش نەکات، ئامۆزاکەی، لە هێرشبردندا، لەنێو ڕەبیەدا برینداربوو... هەر کە من پاش قسەکانی مەحمودی برام سەیری سیروانم دەکرد، ئەو دەستورە تایبەتییەی سیروانم دەهاتە پێش چاو، کە بەلای سیرواندا ببووە ڕەوشت، ئەویش بەر لە هەموو پێشمەرگەیێک خۆی بگەیێنێتە نێو ڕەبیە و بە نارنجۆک بێتە دەست!

هـەر چەنـد سـەیری ڕووخسـارە بزەئامێـز و گەشـەکەی سـیروانم دەکرد، ئـەو سـاتەم دەهاتـە پێش چـاو، کـە چۆن سـەرچڵی دەکات و مـل دەنێت و بەرەو پێش دەچێت و گوێ ناگرێت... هەموو مەبەستێکی لـەوەدا کۆدەکاتـەوە، کە چۆن بـەر لـە هەموو پێشمەرگەیێک هێرش ببات و بچێتـە نێو ڕەبایەکانـەوە... جا ئـەم زووتـر دێتـە دەست، یا لـەم چاپووکتـر دەبن... ئەوەیـان گرێیـەک بـوو تەنها بـە سـەرنجێکی کەیلی پڕ ماناوە ئاڵاندبوومـە قـەد ڕووخسـارە گەشـەکەی سیروانەوە...

(سـیروان) وەک هاوڕێـی پێشـمەرگایەتیم بـوو، برایەکـی گـەورە و مامۆستایەکی بەڕێزی مـن بوو، نـەک لـە قسـەکانی، بەڵکوو لـە ڕەفتارەکانی گونجـاو و ڕێـک و بەجێیەکانـی فێـری زۆر شـت ببـووم... یەکـەم شـتێک ئـەوە بـوو سـیروان حاڵـی کردبـووم، دەبێـت خـۆم بسـەلمێنم، دەوروبـەر ئـاگادار بکـەم، بێدەنگـی شـەقار بکـەم، کـە هـەم هـەر هیـچ نەبێـت بـەرەو ئاسـمان تەقـە بکـەم و بێدەنگی بشـڵەژێنم، هـەر کـە سـیروانم بینـی، لەگـەڵ قسـەکانی مەحمـودی برامـدا دەژی و خەریکـە تووشـی شاگەشـکە بێـت، منیش خەریـک بـوو لـە خۆشیا پەڕوپۆ دەربکـەم و بـاڵ بگـرم... هـەر هیـچ نەبێت تەقـە دەکەیـن و گوێمـان لـە تەقـە دەبێـت...

هـەر چـەن سـەیری ڕووخسـاری سـیروانم دەکـرد، ئـەو سـاتە ناهەمـوارە لـە مێشـکمدا لەنگـەری دەگـرت، کـە دەبیسـم سـیروان بەسـەرەڕۆییەوە هێـرش دەبـات... پێـم وا بـوو ئەمجارەیـان حـەوت ڕۆحـی هەبێـت دەربـاز نابێت... بەسـۆزەوە سـەرنجم لەسـەر سـیروان گواسـتەوە، یەکسـەر سـەیری ڕووخسـارە گەنـم ڕەنگەکـەی ئـازادم کـرد... وەک هەمیشـە بێدەنـگ بـوو، دەسـتی نابـووە ژێـر چەنـەی و بەوردییـەوە گوێـی هەڵخسـتبوو، سـەیری دەوروبـەری دەکـرد، بـە ئـازاد قەنـاس ناسـرابوو، هەنـد دەسـت ڕاسـت بـوو، گـرەوی لەسـەر دەنووکـی کـەو دەکـرد! هەمیشـە لەگـەڵ دڵدارەکەیـدا

بوو، بۆ یەک دەقیقە لێی جیا نەدەبووەوە، گەلێک جار بە دەنگی بەرز دڵدارەکەی دەدواند (بێ تۆ، ژیانی من مردنێکی سەرشۆڕانەیە... تۆ بۆ من ڕۆحیت... تۆ بۆ من ناسنامەی پیاوەتیت... من بێ تۆ ئەو کەسەم لە ڕووم نەیێت لەم سەدەیەدا بڵێم کوردم).

هەموو پێشمەرگەکان دەیانزانی (تفەنگە قەناسەکە) دڵدارەکەیێتی، هەندێک پێشمەرگە بە ئازادیان دەگوت (ئازادی عاشق) وەک عاشقێکی داوێنپاکیش دڵداری لەگەڵ قەناسەکەیدا دەکرد، هەمیشە ئاگای لێبوو، تەنانەت هەندێک جار دەیپێچایەوە، بە جۆرە سۆزێکی عاشقانەوە دایدەژەند و چەوری دەکرد و پاکی دەکردەوە... یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی لە قورسترین شەڕدا، پەنجا فیشەک کەمتری دەتەقاند، تفەنگەکەشی وەک خۆی کەمدوو بوو، بەلام گەر دوابان، یەکسەر شوێنی کاریگەریان دەپێکا... ئازاد گەلێک ڕقی لە زۆربلێیی دەبووەوە، هێمن، لەسەرخۆ، خۆشەویست، گەلێک جار سیروان تووڕەی دەکرد، ئازادیش پێی دەگوت:

- نانێک بخۆ و نانێکیش بکە بە خێر بۆ ئەم دەزگیرانەی من... قەلپیاو، گەر ئەمە حیمایەت نەکات، تۆ ناتوانی ئەوەندە کەشوفشمان بەسەردا بکەیت، هجومکردنی تۆ بە پشتی ئەم دەزگیرانەی منەوەیە... سیروانیش بۆ ئەوەی زیاتر قەڵستری بکات دەیگوت:

- کوڕی باوکم، دەزگیرانی تۆیە، هۆ هی...

نەیدەهێشت قسەکەی تەواو بکات، ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕا و بەتووڕەییەوە پێی دەگوت:

- فلتەفلت.

ئیدی ڕەنگی ڕووخسارەکەی ئەوەی دەگەیاند، لەمە زیاتر قەبووڵ ناکرێت و لە گاڵتە دەچێتە دەر...

هەر کە چاوم لەسەر ڕووخساری ئازاد لادا، یەکسەر دیمەنی حوسێن خۆی هاویشتە نێو دیدە و مێشکمەوە... حوسێن، حوسێنی دەنگخۆش، ڕووگەش، نوکتەباز و قسەزان، بێدەربەست، خاوەن چوار شەهیدن، دوو برا و ئامۆزایەک و برازایەکی شەهید ببوون، دوو براکەی لە شۆڕشی ئەیلولدا شەهید بوون، ئامۆزا و برازاکەی لە شۆڕشی نوێدا شەهید ببوون، هەرسێکیان لە یەک مەفرەزە بوون، حوسێن ڕێی نەدا فرمێسک لە چاوانییەوە بێتە خوارێ، تەنانەت ڕووە خۆش و زەردەخەنە هەمیشەییەکەی ڕووخساریان جێ نەهێشت، بە هیچ جۆرێک قەبووڵی ئەوەی نەدەکرد، سەرەخۆشی لێ بکەن، دەیگوت:

- ئێمە بۆ ئەوە پێشمەرگەین، شەهید ببین، خۆش بە حاڵی ئەوانەی ئەم شەرەفە مەزنەیان بەردەکەوێت.

حوسێن کە بووە پێشمەرگە، لە دوا ساڵی زانکۆدا بوو، سەرەتا پێشمەرگەکان لەو باوەڕەدا نەبوون کە حوسێن بتوانێت ئەو وەزعە ناهەموارەی ئەوسای پێشمەرگایەتی تەحەمول بکات، چونکە لەو سەردەمەدا - سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ بوو - وەزع هەند ناجۆر بوو، دەبا پێشمەرگە بە ڕۆژ لەچیادا بێت و شەویش هەر ئەوەندە ڕوو لە ئاوەدانی بکەن، یەک - دوو نانێک پەیدا بکەن و بەپەلە بگەڕێنەوە، ئەو ڕۆژانە هەشت - نۆ هەلیکۆپتەر بۆ یەک - دوو پێشمەرگە هەڵدەستان... جگە لەمانەش، هەر لەگەڵ هاتنەدەرێی حوسێن، یەکسەر کەسوکاریان گرت، بەرەو خوارووی عێراقیان ناردن. کەچی بە پێچەوانەی مەزەنەکانی پێشمەرگەکان، حوسێن نەک تەنها تەحەمولی

کرد، بەڵکوو هەند بەگوڕ و بەورە بوو، کەس باوەڕی نەدەکرد، کوڕە خواپێداوێکی وەکوو حوسێن، بە ناز و نیعمەت بەخێوکراو، تا ئەوکاتەی نەببووە پێشمەرگە، چیا و دەشت و دەری نەبینیبوو، تەنانەت جلی کوردیشی لەبەر نەکردبوو، کەس لەو باوەڕەدا نەبوو ببێتە ئەم کوڕە، حوسێن خۆی دەیگوت:

- ئەوەی لە چیا و لەنێو پێشمەرگە و ئەم ڕەش و ڕووتانەی میللەتا فێری بووم، دە قات بەقەد قوتابخانە و دانیشگا بوو... ئێرە پیاو دروست و پوختە دەکات، ڕایدەهێنێت بۆ ئەوەی بتوانێت بە ورەی بەرزەوە ڕووبەڕووی خۆی ببێتەوە.

حوسێن پێی وابوو، ئەو کەسەی بتوانێت بەسەر خۆیا زاڵ بێت، حەز و ئارەزووەکانی خۆی دەستەمۆ بکات، ئەوا هەرگیز نابەزێت، سڵ ناکاتەوە و ڕێی ترس لە خۆی دەگرێت، دەروونیشی خاوێن و بێگەرد دەبێت، لە لایدا وردە پێداویستییەکانی ژیان دەبنە شتی زیادە و بێکەڵک، حوسێن چەند جارێک دەیگوت:

- پێویستی من بە لەتێک نان، پەنا بەردێک، سروشتێکی کێوی، دەوروبەرێکی خاوێن، دڵێکی سافە... ئەمانە بەلای منەوە، کەرەستەی بەهەشتی هەمیشەیی دەروونن، بناغەی سەربەستین... ئای کە حەزم لەو سەربەستییە سەرکێشەیە، کە جڵەوی هیچ یاسایێک نەتوانێت ڕامی بکات... ئەگەرچی لێرەدا ئەو سەربەستە نیم، بەڵام گەلێک جار لە تەنیایی و ڕاماندا تفەنگەکەم بۆم باس دەکات، (ڕێیەکە دیارە و هەنگاوی دەوێت) حوسێن هەمیشە بەرەوپیری هەنگاوی نوێوە دەچوو... هەر کە مەحمودی برام قسەکانی تەواو کرد، خەریک بوو لە خۆشییا تووشی شاگەشکە بێت... هەند کەیفخۆشی بە ڕووخسارییەوە دیار بوو، قسەی

پێ نەدەكرا...

سەرنجم لەسەر حوسێنیش گواستەوە، بەوردی سەیری ئەملا و ئەولام دەكرد، یەكە-یەكە پێشمەرگەكان، بۆ ساتەوەختێك، لەنێو دیدەمدا لەنگەریان دەگرت، ئەوە چالاك و جەلال و هۆشیار، بزە نیشتووەتە سەر لێوانیان، بە لاچاوەوە سەیری (ئەحمەد بی كەی سی) دەكەن - كە چوارمشقی دانیشتووە، دەستەكانی هەڵپێكاوە و لەژێر چەنەیدا كردوونی بە دنگەی سەرە زل و مووداره‌كەی، هەردوو ئانیشكیشی چەسپاندووەتە سەر پشتی (بی كەی سی)یەكەی، خێسە لە مام ڕەشیدی باوكی دەكات، ئەم باوك و كوڕە بە هیچ جۆرێك دانوویان بە یەكەوە نەدەكوڵا، هەردووكیان (بی كەی سی)یان پێ بوو، هەمیشە پرتە و بۆڵەیان بەرامبەر بە یەك هەبوو، (فەرید)یش ئاگرەكەی بۆ خۆش دەكردن... باوك و كوڕێكی سەیر بوون، گەر مام ڕەشید هەشت شریتی لە خۆی بەستبا، ئەحمەد دەی لە خۆی دەبەست، خۆی لەنێو فیشەكدا سوور دەكرد، هەردووكیان حەزیان بەوە بوو لە یەك تیپدا نەبن، چونكە هەر یەكێكیان داوای نەقڵی كردبا، سەراپای پێشمەرگەكان ناقایل دەبوون، گەلێك حەزیان بەوە بوو هەر بەیەكەوە بن... كە ناخۆشییەك دەكەوتە نێوان ئەم كوڕ و باوكەوە، سەربەقوڕیان دەهێنایە پێكەنین، بە تایبەت كە مام ڕەشید بیانووی بە ئەحمەد دەگرت، لەسەر هەر شتێك لێی تووڕەبا، بەم سەرەتایە دەستی پێدەكرد:

- سەر زل ئێژی گای، ئەو ڕۆژە چاوم پێوە بوو بە(بی كەی سی)وە تەقەت دەكرد، بۆ؟ بۆ وەك باوكی خۆت دەست بە فیشەكەوە ناگریت؟ دوو - دوو تەقە بكە، فیشەكی شۆڕش خەسار مەكە...

ئەوجا وەردە وردە دەهاتە سەر ئەو قەوانەی كە دەیان جار لێی

دەدایەوە.

بە حەوت ساڵ لە مەکتەبدا فێر نەبووی ناوی خۆت بنووسی... ئەترسم ئێسا بێژی بوومەتە پیاو و پێشمەرگەم، سا وە سیجزمەی قورعان، چاوی منت پێوە نەبێت، خەڵکی شێر دەیخوات، بەڵام تۆ سەگ وە گووەوە دەتبات...

ئەحمەدیش بێ شەرمکردن یەکسەر بە باوکی گوت:

- ئەرە کێ منت وە پشتەوە نەبم، کەر ئەتخوات.

ئیدی ئەوشتەی لەسەری ناکۆک بوون، ون دەبوو، چ کەسێکیش نەیدەزانی لەسەر چی ئەم باوک و کوڕە، لە وەخت و ناوەختا، ئەم مەراقەیە دەنێنەوە، مام ڕەشید خەڵکی یەکێک لە دێهاتەکانی گەرمیان بوو، هەر لە ساڵەکانی حەفتا دەرکران و عەرەبیان هێنایە دێیەکەیان، بۆیە لەگەڵ ئەحمەدی کوڕیا - پاش ئاشبەتاڵ، دەچنە ئێران و دەبنە پەناهەندە... درەنگوەخت دەبیستن، شۆڕشی نوێ سەری هەڵداوەتەوە، بە هەر جۆرێک بێت دێنەوە ئەمدیو، بە ئازاریەتی خۆیان جێ بۆ خۆ دەکەنەوە... ئەحمەد گێلۆکە بوو، قەد هیچ شتێک بە مێشکیا نەدەچوو، تاقە شتێک کە تێیدا کارامە و لێهاتوو بوو، شەڕکردن بوو، وەک ئەوەی بۆ شەڕکردن لەدایک بووبێت، هەموو هونەرەکانی شەڕی دەزانی... کەچی نەیشیدەزانی بۆ شەڕ دەکەین... زۆر جار (فەرید) سەری دەنایە سەر و پێی دەگوت:

- چاکە کاکە ئەحمەد، ئێمە ئەم شەڕە بۆچی دەکەین؟

- جارێ بێژە ئەحمەد بی کەی سی.

- چاکە کاک ئەحمەد بی کەی سی بۆچی شەڕ دەکەین؟

- بۆ نەوت...

- چی تریش؟

ئەویش ئەو بهاتایەتە سەردەمی، لەخۆڕا ملی پێوە دەنا دوا وشەیشی لەسەر (نەوت) دەگیرسایەوە و دەیگوت:

- نەوتمان دەوێت... تا نەیێژی کورد نەوتی نییە.

- ئێ ئەوە وتمان نەوت... بەلام چۆن؟

- برابەشی دەکەین.

- چۆن؟

- وە تەنەکە!

- ئاخر چۆن؟

- چۆن چۆنی چی؟ بەشی دەکەین و ئەهـ..

- ئێ، باشە نەوتەکە؟

فەرید ئەم پرسیارەی دەکرد، نەیدەهێشت وەلام بداتەوە. یەکسەر بە پرسیارێکی دی، باسەکەی لا دەگۆڕی.

- ئەرێ، بۆمەسەلەکە، ئەوەی کە هەر خۆم و خۆت دەیزانین... چیت کرد.

- دەیتێرم.

- دەزانم... بەڵام کەی؟

- با ببین وە حوکمەت!

- چ حوکمەتێ؟

- حوکمەت، حوکمەت... حوکمەتی کورد!

- دەزانم حوکمەتی کورد، بەڵام چۆن؟

- توو خوا کا فەرید، سەر مەنێ وە سەرمەوە... ئێژم گاڵتەم پێ مەکە.

- بە سەری تۆ گاڵتە ناکەم... حەز دەکەم بزانم چۆن حوکمەتێک؟

- ئێژم حوکمەت برپاوە! نەوتمان دەبێ... تەیارەمان دەبێ، تۆپمان دەبێ... ئێتر هەموو شتێ وە کوردی دەبێ... عارەوەکانی دێیەکەمان دەردەکەین و دەیاننێرینەوە بۆ جەحەنەمەکەی خۆیان... سکەمان دەبێ... (عەلەم)مان دەبێ... کا فەرید ئێتر مەیێژە ئەحمەد بێ کەی سی هیچ نازانێ...

- کەی من وام گوتووە؟

- ئەزانم هەر ئێژیت.

- نە بە سەری تۆ.

- وە قەبرەکەی باوکت هەر ئێژیت... دەزانم.

فەرید دەیزانی لەمە زیاتر بڕوات، خەستتر دەبێت، ئەوجا بەپێی حەزی ئەحمەد قسەی دەکرد.

- وا بزانم هەر ئەو (چاوجوانە پرچزەردە کەڵەگەتەی) کە خۆم و خۆت دەیزانین، هەر ئەو دەهێنێت.

- کا فەرید کەشپی مەکە*.

- نا... کەشفی ناکەم، بەڵام من بزانم، گەر فریای نەکەوی، دەیدەن بە شوو.

- وە حەموو عەقڵێکتەوە... حەی چۆن شوو ئەکات، ئەی پێم نەگوتی: گوتویەتی یا کاک ئەحمەد بی کەی سی یا گڵ.

- دەزانم وای گوتووە، بەڵام باوکی بەزۆر دەیدا بە شوو.

- حای... ئەی بۆچی پێشمەرگەم... ئەی ئەم (بی کەی سی)یەم بۆچییە؟

- ئاخر دەڵێم، ئاگات لێ بێت، دەیدات بە شوو...

- ئەگەرەکێ پیاوە دەی، بێژە پێی، ئەگەرەکێ پیاوە با بیدات بە شوو، دەی، دەی دەی...

دە - دوانزە جار لەسەر یەک دەیگوت: دەی، دەی... ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕا، دەمی کەفی دەچڕاند، دووبارە دەیگوت:

- دەی ئەگەرەکێ پیاوە.

* کەشپی مەکە: یانی کەشفی مەکە

زۆر بەوردییەوە سەرنجی ئەحمەد و باوکیم دەدا... سووکە پرسیارێک بە مێشکما گوزەری کرد (شەڕی ئەمجارەمان گەلێک سەختە... تۆ بڵێی یەکێکیان شەهید نەبێت... خۆ مام ڕەشید سەرەڕای ئەوەی (بی کەی سی)ی پێیە، بەڵام زۆر جار بە پێوە هێرش دەبات و مل دەنێت، یەکە-یەکە چاوم بەسەر پێشمەرگەدا گێڕا، هەر کە سەرنجم گەیشتە سەر دەست و پێی خۆم، بەرچاوم لێڵ بوو، سووکە سەرئێشەیێک ڕووی تێکردم.

***

هەر کە سەعات گەیشتە دوانزەی شەو، هەموو ئامادە بووین، مەفرەزە، مەفرەزە، بە مەسافە کەوتینە ڕێ... سەرەتا دەبا بە چیاکەدا هەڵگەڕێین و بچینە ئەودیو... شەوێ بوو، چاو چاوی نەدەبینی، هەورێکی تەڵخ بەری ئاسمانی گرتبوو، بەفریش پرۆشەی دەکرد، گیانمان بەوە بوو، هەم خۆمان شارەزا بووین، هەم دەلیلەکانیشمان وریا و شارەزا بوون، لەگەڵ ئەمەشدا، دەیان جار پێمان دەخزا و دەکەوتین... یەکسەر ئەو نوکتە باوەی شارانم وەبیر هاتەوە - کە هەندێک پێشمەرگە، لەوەوبەر بۆیان گێڕابوومەوە:

( هەندێک دەوڵەمەندی زەمانساز، لەنێو هەندێک خەڵکی زۆر تایبەتیدا، تەنها بە قسە خەون و ئومێدیان لەگەڵ کورد و سەرکەوتنی کوردستانە، لە ڕەفتاریشدا کارێک ناکەن لەلای دەوڵەت لەکەدار ببن... لەلای ئەوانە، شەوی تۆف و کڕێوە و باران، ئەو شەوانەی کە مێردان دەیکەنە قەلای خۆیان، لەلای ئەوان شەوی پێشمەرگەیە!

( گوایا جارێکیان کابرایەکی خواپێداوی دەست بە کلاوی خۆ گرتووی بە ڕواڵەت لەخواترس، لە هۆڵە گەرم و گوڕەکەیدا - پاش تەواوبوونی

كاسێتێكی ڤیدیۆی سێكسی، بەئاستەم پەنجەرەی هۆڵەكە دەكاتەوە تا سەیرێكی دەرێ بكات... نەك تووشی هەڵامەت ببێت، بەپەلە دەكشێتە دواوە، ڕوو لە خێزانەكەی دەكات و پێی دەڵێت:

- (ئافرەت... دەزانی ئەمشەو شەوی پێشمەرگەیە!)

بۆ نا... بۆ ئەم شەوەی ئێمە شەوی پێشمەرگە نەبێت، بۆ نا؟ ئەی ئێمە بۆ كێی دەكەین؟ خۆ سبەینێ هەر هەمان زەمانسازی دەوڵەمەند - گەر سووكەمقاوەماتێ... شتێ... یانی شیتۆكەیێک - ببێت، خۆ پیاو ناوێرێت لە مەجلیسیاندا قسان بكات، یەكسەر لێت ڕادەپەڕن و دەڵێن:

- برا، ئێوە وەزعتان، زۆر لە وەزعی ئێمە باشتر بوو... چونكە هەر ساتێكی تەمەنی ئێمە... لەنێو ئەم (شارە دۆزەخەدا) مردنێک بوو بۆ خۆی... دڵەڕاوكێ، ترس... خۆ(دڕندەكان) سڵیان لە هیچ شتێک نەدەكردەوە... ئێمە لێرەدا، دڵمان، خەونمان، هیوامان لەگەڵ ئێوەدا بوو...

ئیدی بە هەموو حیساباتێكی سیاسییانە، خزمئامێز و چاولەبەری دەعوەتێک، شتێک... متێک! خوێنی ئێمە دەبێتە پارسەنگی خەونی ئەو چاپلوسە زمانسازە زماندرێژانەی كە پیاویش قەرزاربار دەكەن! هیوایان دەبێتە پارسەنگی برسییەتی و دەربەدەری و كێچ و ئەسپێ و تەوزیع و بێنازی ئێمە... دڵەڕاوكێیەكەشیان - ئەڵبەتە - گوللەبەندی ئێمە بووە و پێمان نەزانیوە.

دوێنێ شەو، بۆ یەكەم جاری تەمەنم هەستم بەوەكرد، كە گورگم... وەک گورگ، زیت و چوست و بەورە، چیای بەفرینم خستبووە ژێر هەنگاوی تیژڕەو... دەرۆشتین، تاریكە شەوێكی ئەوتۆ، یاد و بیركردنەوە، بێشەرم، خۆیان لەبەر زەین و دیدەمدا ڕووت دەكردەوە، لەو تاریكە شەوەدا،

خۆیان لە شێوەی پرسیاری ڕووت و قووت دەخستە ڕوو... دەڕۆشتین، لەنێو تاریکی ئەو شەوە توفەدا، هەنگاوی بەرەوپێشەوەچوونمان دەنا، پرسیاریش مێشکمیان کردبووە شانۆ... شانۆی سەما، شێتانە کۆتی بێدەنگییان دەپچڕاند، لە ڕووم دەوەستان و داوای وەڵامیان لێ دەکردم... دەڕۆشتین، پرسیارەکان دادگای دەروونمیان گەرمتر کرد.

- چی دەکەن؟

- هێرش دەبەین.

- بۆچی؟

- خاک لە داگیرکەر پاک دەکەینەوە.

- کەم هێرشتان بردووە؟

- نەخێر زۆر.

- سەرئەنجام؟

- خەڵکانێکی زۆرمان کوشتووە... لێمان کوژراوە، دەسکەوتمان هەبووە...

- کێن ئەو خەڵکانە؟

- سەرباز، جاشی خۆفرۆش.

- پێت وایە مردنی ئەوانە، بۆ دەوڵەت دەکاتە زیانێکی گەورە؟

- ڕەنگە سووکە زیانێک بێت.

- ئەی شەهیدبوونی کەسانی ئێوە؟

- زیانێکی گەورەیە، بەڵام خوێنەکانیان نرخی سەربەستییە.

- کام سەربەستی؟

- هەموو جۆرە سەربەستییەکان.

- جا چ شوێنێک، چ وڵاتێک، چ بەهەشتێکی سەر ئەم زەمینە، هەموو جۆرە سەربەستییەکانی تیادایە؟

- گەر هەموو جۆرەکانیان نەبێت، ڕەنگە لە هەرجۆرە هەندێکیان هەبێت.

- بە چی وەدەستیان هێناوە؟

- بە خەبات، تێکۆشان، کوشتن، کوژران،ماڵوێرانی، دەربەدەری، برسییەتی و لەخۆبوردن.

- خۆ ئێوە، لەم شتانەی باسی دەکەن، کارامە و لێهاتوون، ئەڵبەتە نەفەسیشتان درێژە؟

- بەڵێ...

- جا کە، ئێوە بەدرێژاییی مێژوو و تا ئێستایش هەر شانازی بەوەوە دەکەن، کە نەفەس درێژن، لەخۆبوردوون، کەچی تا ئێستا هیچتان بە هیچ نەکردووە...

- ڕاستە، بەڵام دوژمنانمان دڕندەن... گەلێک دڕندەن.

- جا چ کەسێک(کەروێشک) حەقی خواردووە... هەر گورگ و شێرە حەق دەبەن و دەبێت حەق لەوان وەرگیرێت...

- ئەی ئەوە نییە هەوڵ دەدەین... ئەی ئەوە نییە ئامادەی هێرشین.

- بۆ کوشتن و ڕەبایە گرتن و هێرش، دەبێتە مایەی ئەوەی دەوڵەتی داگیرکەر ملکەچ بکات؟

- پێم وانییە.

- بۆ؟

- ڕەنگە هەزارانی ئەو کەسانەی بەر گوللەی ئێمە دەکەون، بە تایبەت جاشە کوردەکان، دەوڵەت خۆی مەبەستی بێت لەناو بچن، بمرن، نەمێنن، دەوڵەت دەیەوێت کورد بە دەستی کورد بداتە کوشت...

- ئەی ئەوانەی کە کورد نین؟

- بەلای دەوڵەتەوە تەنها (ژمارەن)، بۆ ئەوە دەیانژێنێت، بکوژن و بکوژرێن.

- چاکە... سەرەنجام...

- دەڵێم سبەینێ دەبێتە ڕۆژێکی مێژوویی... مێژووە نەوسنەکەی ئێمە و ئەوان... ئێمە سەرکەوتنێک تۆمار دەکەین، ئەوانیش نوشستیێک لە خۆیان دەشارنەوە.

- چۆن؟

- ئێمە هێرش دەبەین، غافڵگیریان دەکەین... سەرکەوتن بۆ ئێمەیە،

ئێمە لەسەر حەقین... سەر دەکەوین.

- ئا... بۆ سبەینێ... نەک دوو سبەی...

- شەڕە و قانوونی خۆی هەیە... ڕاستی و لەسەر حەق بوون چەکێکی کاریگەرە.

- نەخێر، پێم وا نییە لە داهاتوودا کەسێک جورئەتی ئەوەی هەبێت، لە سەرکەوتوو بپرسێت، ئایە لەسەر حەق بوو یا نا؟

- ئەمە حیساباتی سیاسەتە.

- بە هەموو حیسابێک، ئەوەی لە جەنگدا مەبەست بێت، سەرکەوتنە، حەقیش موڵکی سەرکەوتووە، چ کەسێک بۆی نییە هیچ بڵێت... گرنگ ئەوەیە حەقیقەتێک ڕەچاو بکرێت، ڕەبیە گرتن، کوشتن، نابێتە مایەی سەرکەوتن.

- دەمەوێت زیاتر حاڵی بم.

- دە ڕۆژی دی، یا مانگێک، دوو مانگ، ئەو کارانە لەبیر دەچنەوە.

- بەڵام میللەتان بە هێزی بازوو و بە خوێنی خۆیان سەرفراز بوون...

- هەر میللەتە جۆرە دوژمنێکی هەیە.

- دوژمنی ئێمە بێقسوور بووە.

- لە چی؟

- کوشتن، وێرانکردن، هەموو کارێکی نائینسانی.

- بەڵام زیرەک و وریا بە... کورد بە مێش دەزانێت، بۆ پێشمەرگە (دی دی تی ڕۆکێت) و (سۆخۆ) بەکار دێنێت، بۆ ئەوانی دیش(هەنگوین)، تا زیاتر لە دەوریا کۆ ببنەوە.

- ئەمە دوژمنەکەمان وامان لێدەکات، ئەی خۆمان.

- بۆ تا ئێستا قسوورمان بە خۆ کردووە... چیمان بە یەک نەکردووە؟

- جا چی ماوە؟

***

دەڕۆشتین و شەویش تاریکتر دەبوو، پرسیارەکانی مێشکم زیاتر ئاڵۆز و بێ وەڵام دەبوون... گەلێک پرسیاری ئەوتۆ، مەگەر لە تاریکەشەوێکی وەک دوێنێ شەودا جورئەتی ئەوەیان هەبێ خۆیان بخەنە ڕوو و قایلیش بن بێ وەڵام بمێننەوە...

سەرباری ئەوەی کە کۆمەڵێک پێشمەرگەی زۆر بووین، دەخزاین و هەڵدەستاینەوە، کەچی شەوێکی گەلێک کشومات بوو، تەنانەت سەگەکانی ڕەبیەکانیش نەدەوەڕین... گەیشتینە جێ، بەپێی نەخشەی دیاریکراو دامەزراوین، مەحمودی برام، بۆ دڵنیابوون، هەموو پێشمەرگەکانی بەسەر کردەوە، ورەی زیاتری پێ دەبەخشین، دەیگوت:

- گەر ئەمجارەیان سەرکەوتین - ئەڵبەتە هەر سەریش دەکەوین - ئەوە بۆ دۆست و دوژمنی دەسەلمێنێت کە خاکی ئێمە، گۆڕستانی دوژمنی داگیرکەرە، دەبێت هەر واش بێت...

هەر كە مەحموود دەیگوت: دەبێت ئەمجارەیان سەركەوین، دەیان سەركەوتن و نەبەردی قارەمانانەی پێشمەرگەم دەهاتەوە بەرچاو، كە گەلێک جار لە دەمی هەندێک پێشمەرگەی بەتەمەنم بیستبوو، كە لە شۆڕشی ئەیلولدا، لە هەندرێن و زۆزک، لەسەر تیژ و سپیلک و شیوەسوور، لە گەرمیان و بەمۆدا، چییان بە داگیركەر كردووە، چۆن لەو شەڕانەدا سەر كەوتوون، پاشانیش وەک دوو دێڕێ لە بڵاوكراوەیێک، یا لە یاددا تۆمار كراون، بێ ئەوەی بووبنە بناغەی ئەو(سەركەوتنەی خەونی ئێمە)!

ئەگەر لەو كات و شوێنەدا نەبا، حەزم نەدەكرد لە مەحمود بپرسم:

- (كام سەركەوتن؟ ئەو سەركەوتنەی بۆ چەند ڕۆژ و مانگێک پفمان پیا دەكات؟)

یا ڕاستتر، دەمویست ئەوەی بخەمەوە یاد، كە خۆی دەیان جار بۆی باس كردبووین (كورد چ جارێ و لە چ شۆڕشێكیا، لە ڕووی عەسكەرییەوە نەدۆڕاوە) منیش پێی بڵێم:

(ئەدی دەوڵەت لە ڕووی عەسكەرییەوە بە ئێمە دەدۆڕێت؟

نازانم گەر پرسیارم كردبا، ئەو چ وەڵامێكی دەدامەوە، بەڵام بەجوانی وەڵامی ئەم پرسیارەی خۆمم دەزانی...

هەر كە مەحمود دڵنیا بوو، هەموو شتێک بە پێی نەخشەكە ساز و ئامادەیە، ماخۆلانی تێكەوت و چاوەڕێی یەكەم تەقەی دەكرد، زوو زوو سەیری سەعاتەكەی دەكرد، كە بڕیار بوو لە سەعات چوار و چارەكدا دەست پێ بكرێت...

شەوێکی ماوەدرێژ بوو، هەموو چاوەڕێی سەعاتی سفرمان دەکرد، ئەو ڕەبیەیەی بۆ ئێمە داندرابوو - کە مەحمود خۆی هەڵبژاردبوو - ڕەبیەیێکی گەلێک سەخت بوو، لە پەڕ بوو، بە حیساباتی مەحمود و پێشمەرگەکانی دی، لە نیو سەعات زیاتر خۆی ناگرێت، کەچی کە یەکەم تەقە دەستی پێکرد و شەوی بێدەنگ هەژێندرا، لەبەر ئاگری ئار پی جی و گوللەباران و گوللەی تەنویر، چ کەسێک هەستی بەوە نەدەکرد کە شەوە... لە پێنج دەقیقەی یەکەمدا، دە - دوانزە گوللە ئار پی جی نران بە ڕەبیەکەوە، دەستەی هجومیش بە نارنجۆک و کلاشینکۆفەوە هێرشیان برد، پاش سێ - چوار دەقیقەیێک کشانەوە، بێ ئەوەی بتوانن لە سیمە دڕکدارەکانی دەوری ڕەبیەکە بپەڕنەوە... بە دوو برینداری سووکەبرینەوە کشانەوە... ئەوەندە (تەنویر) بە ئاسمانەوە بوو، ببووە ڕۆژی ڕۆشن، گرمە و دەستڕێژ تا دەهات گەرمتر دەبوو، هەر لە نیو سەعاتی یەکەمدا، چوار ڕەبیە تەسلیم بوون... مەقەڕ سرپەکان و مەقەڕ فەوج بە جۆرێک شڵەژابوون شێتگیر ئاسا بە هەموو لایەکدا کوێرانە تەقەیان دەکرد... لەلای ئێمەوە جارێکی دی دەستەی هجومی پێشمەرگەکان، بە گوڕ و تەکانێکی تر، بەرەو ڕەبیە دیاریکراوەکە چوون و ئێمەیش حیمایەمان دەکردن... کەچی وەک جاری پێشوو گەڕانەوە، لەنێو ڕەبیەکە بەرگرییەکی سەخت دەکرا، تەقەکانیان ئەوەندە گەرم بوو، کەم کەس دەیتوانی سەر بەرز بکاتەوە بەجوانی بڕوانێتە ئەو ئاگربارانەی، کە زیاتر لە پانزە کیلۆمەتری چوارگۆشەیدا دۆزەخێکی داگیرساندبوو...

نازانم چۆن بوو، لەو کاتە سەخت و ناهەموارییەدا پێکەنین دایگرتم... ئەو قسە خۆشەم وەبیر هاتەوە کە پێشمەرگەیێکی هاوڕێم بە تەمسیلکردنەوە بۆی گێڕامەوە:

- چەند ئەفەنییێکی بە دەم خوێن گەرم و بە پرتەوبۆڵە، کە هیچ شتێکیان بەدڵ نییە، شەوێ لە نادیدا دادەنیشن، یەکێکی نگ شێریان بەوانی دی دەڵێت:

قەت ئەمە وەزع نییە، پێشمەرگە چۆن وا دەبێت، بۆچی فلانە ڕەبیە و فلانە شوێن ناگرن، خۆ کارەکە ئەوەندە قورس نییە – لەو کاتەدا دەست بۆ پێکەکەی دەبات و بەڕەفیقەکانی دەڵێت: سەیر بکەن، بلێین ئەمە ڕەبیەکەیە - پاکەت و شقارتەکەشی دەخاتە ئەملا و ئەولای پێکەکەی، ئەمانەش دوو مەفرەزە پێشمەرگەن، بە هەردوو دەست پاکەت و شقارتەکە لە پێکەکە نزیک دەکاتەوە و – سەیر بکەن و چاوتان لێ بێت، گەر ئاوها بۆی بێن، ئەوا ڕەبیەکە موحاسەرە دەبێت - پاکەت و شقارتەکە دەگەیێنێتە پێکەکە و دەڵێت:

ئەوهاش بەئاسانی دەگیرێت... ببینێ پێکەکەی هەڵدەدات: بە سەری ئێوە ئەوەندە قورس نییە، خۆ چاوتان پێوە بوو چەن بەئاسانی گرتم!

لەگەڵ گەرمی تەقە و دەسرێژەکەدا، زیاتر پێکەنین دەیگرتم، یەک - دوو جار لەبەر خۆمەوە گوتم: (بەڵێ، بەڵێ، قورس نییە و دەیگرێت).

وەک دەستووری پێشمەرگایەتی، هەر ڕەبیەیێک بگیرێت سەڵیەیێک فیشەکی گڕدار بەرەو ئاسمان دەتەقێندرێت... یەک لە دوای یەک، لە هەموو ڕەبیەکانی دییەوە، سەڵییە فیشەکی گڕدار بەرەو ئاسمان دەچوون... تەنها ئەو ڕەبیەیەی بۆ ئێمە دیاری کرابوو بەرگری ژیان و مردنی دەکرد، هەندێکیش ئێمەیان شڵەژاندبوو، وردە وردەش دنیا ڕۆشن دەبووەوە... دوژمنی داگیرکەریش دەیویست بە هانایانەوە بێت، کەچی چاکتر دەکەوتنە نێو ئەو بۆسانەی کە پێشوەخت بۆیان دامەزرابوون... ڕۆژی حەشر بوو، تەنها تاقە ڕەبیەکەی لای ئێمە خۆی

نەدابووە دەستەوە... پێم وا نییە چ جارێک مەحمودم ئاوها بەغەمباری و ڕەنگبواردوویی بینیبێت، هەموو پێشمەرگەکانی تیپەکەی ئێمە بە وردی کاری خۆیان وە ئەنجام گەیاندبوو، تەنها ئێمە نەبێت. ئەگەرچی لە سەرەتادا ناوی مەحمودی برام لەنێو ناوی ئەوکەسانە نەبوو، کە هجوم دەکەن، کەچی لە ساتەوەختێکدا شەش پێشمەرگەی کۆکردەوە و بەمنی گوت:

- مستەفا، ئێوە حیمایەمان بکەن و ئێمە هێرش دەبەین.

زۆرم حەز دەکرد ڕێی لێ بگرم، کەچی شەرم لە پێشمەرگەکان، تەنانەت شەرم لە خودی مەحمودیش، ڕێی قسەی لێ بڕیم، بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، یەکسەر خۆمم تێکەڵ بەو شەش پێشمەرگەیە کرد، مەحمود دوبارەی کردەوە.

- ئێوە حیمایەمان بکەن.

چ وەڵامێکم پێ نەبوو، تێکەڵیان بووم، سەرەتا لە دوو لاوە بە ئار پی جی ڕەبیەکەمان داگرت، هەمووی پێنج - شەش دەقیقەی پێ نەچوو، خۆمان لەنێو ڕەبیەی خاپووردا بینییەوە... مەحمود، دوو - سێ شەقاو پێشم کەوتبوو، هەوڵم دا نزیکی ببمەوە، دەنگی تاقە تەقەیێکی نزیک مەحمودی بە دەما خست، تا فریای کەوتم بەرزی بکەمەوە، کار لە کار ترازابوو، جێ گوللەیێک چاوانەی بە نەخشی تەوێڵی دابوو، خوێن گەرم و فوارەی دەکرد، سەریم خستە سەر دەستم، بە حەپەسانەوە سەیری ئەو ڕووخسارەیم دەکرد، کە خوێن هەردوو چاوی قەپات کردبوو... دەنگی دەسڕێژێک ئەو بێدەنگی و حەپەسانەی شێواندم... بەپەلە لام کردەوە... تەمەس یەکێک لە سەربازەکان بە برینداری، لە دەرەوەی ڕەبییە داتەپیوەکەدا، لە دووری هەشت - نۆ مەترێکەوە، تەقە

لە مەحمود دەکات، پێشمەرگەیێکیش، هەر لە هەمان کاتدا چاوی تێوە دەبێت، هەڵدەکوتێتە سەری و سەڵیەیێکی پێوە دەنێت.

ئەگەرچی لە خۆ نەچووبووم، سەیرم دەکرد و دەجووڵانەوە، بەڵام ئاگام لە هیچ شتێک نەمابوو، هەر ئەوەندە دەزانم کلاشینکۆڤە قۆناغ خوێناوییەکەی مەحمودی برامم لە شان نا، ئیدی بەحەپەسانەوە سەیری ئەملا و ئەولام دەکرد... نازانم چۆن تەرمی مەحمود و بریندارەکانی دییان گەیاندە ئەودیو... نازانم خۆیشم چۆن هاتووم، ئاگام لە دەوروبەری خۆم نەبوو، نەمزانی چۆن (ئا لێرەدا) قەبریان بۆ هەڵکەند، کێ بانگی کردم... بەڵام هەر کە دایانپۆشی، نەک فرمێسک، پێم وایە خوێنی لەشم لەبەر گەرمی دەروونم ببووە هەڵم، لەو کاتەدا هەستم بە بوونێکی نیمچە زیندووی خۆم کرد... ئەوا سێ سەعاتێکە مەحمودی برام لەنێو گۆڕدایە... بەئاستەم دەبینم پێشمەرگەکان باسی حەڤدە شەهید و چەند برینداریکی دی دەکەن... باسی دیل و دەسکەوت و کوژراوێکی ئەوتۆ دەکەن، عەقڵ نایبڕێ... بەڵێ، ئێستا دەپرسم لە خۆم، لە کەسێکی خۆمئاسای بێکەس دەپرسم:

ئایا ئینسان، ئینسانی ئەم سەدەیە، لەم ڕۆژهەڵاتە، دەتوانێت بەرگەی سەرکەوتنێکی مەزن و پشتشکانێکی مەزنتر بگرێت، بتوانێت باوەڕیش بە خۆی بێنێت، کە (هەیە) و دەتوانێت بەردەوامی بە ژیانی بدات؟

ڕەنگە کەسی مردوو تا لە ژیاندا بووبێت، هەند مردنی خۆی بەلاوە گران نەبووبێت، بە تایبەت بەقەد ئەوانەی کە ئەمی مردوویان خۆش ویستووە... ئەوا من(بڵێین)! دەتوانم، بە هەر جۆر بێت، ژیان بمگوزەرێنێت یا ژیان بگوزەرێنم، هانی خۆم بدەم... ئەوا من وا... ئەی جوان؟

***

ئەمە من و جێیەکەم و چیا سەخت و ڕووتەکەی بەرانبەرم و ئاگرستانەکەی ئەودیوی، ئەو دیوەی کە بەشێکی تەواوی تەمەنی هەرە خۆشی و منداڵی و هەرزەکاریمی هەڵمژیبوو، لەنێو ترس و حەپەسان و دووکەڵدا، فێری پشت بە خۆ بەستنی کردم، ئاشنایەتی لەنێو من و ئەو و هەورازەڕێ و برسییەتی پتەو کرد (شێخ ڕەشەکەی) بابوباپیریشی لە فرسەتێکدا دوو چڵی گەورەی پیرۆزی خۆی پێ بەخشین، من و مەحمودی برام لە جەولەیەکدا لەلای دارتاشێک کردمان بە قۆناغەتفەنگ، قۆناغی کڵاشینکۆفەکانمان گۆڕی، (شێخ ڕەش) شەو لەژێر سەر، ڕۆژ لەسەر شان، لە مەترسیدا ورەی پتەوتر دەکردین...

ئەوا(ئێستا)ش دەستی بێهێزم بەسەر هەر دوو قۆناغی تفەنگەکاندا دەهێنم، سووکە ئارامێ ڕووم تێدەکات و دڵم دەداتەوە، دڵنیام دەکات هەموو دار و دەوەن و چڵە دارێکی ئەم وڵاتەم، پشت و پەنامن... هەر دەست لەسەر قۆناغەکان هەڵدەگرم، تەزوییێکی سارد سەراپام دەگرێتەوە، وەک ئەوەی زمانی حاڵی خوێنەکەی مەحمود و چڵە بە(قۆناغ) بووەکەی (شێخ ڕەش) پێم بڵێن: (بێ ئێمە، ژیانی سەرفرازییت مەحاڵە).

ئەمە من و (ئێستا) و جێیەکەم... بەڵام لە پشتی منەوە، زنجیرە چیایێکی دیی سەخت و ڕووتتر، لەگەڵ ئەم زنجیرە چیای بەرانبەرمدا بوون بە دایک و باوکی ئەم دۆڵە درێژەی کە (ئێستا) من و غەم و ئاڵۆزی خەیاڵ و حەپەسانی لە پەنا گابەردێکدا ڕاگرتووە... ئەم دۆڵە تەنگ و درێژە هەزاران پیرەدار و سەدان گابەرد و دەیان کەندەڵانی گرتووەتە خۆی.

زنجیرە چیا سەخت و ڕووتەکەی لای پشتمەوە، بە باریکەڕێیەکی پێچاوپێچ بەستراوەتەوە، ئەم دۆڵە باریکە، ڕێیەکەش سەیرە، مرۆڤ

دەبێت لە هەندێک شوێنیا بە چنگەکرێ سەر بکەوێت، لە گەلێک شوێندا مرۆڤ بەرەو بەردەلان دەبات، گەر شاخەوان و شارەزا نەبێت، ئەوا هەندێک توولەڕێ بەرەو هەلدێر و ڕەوەزی ئەوتۆی دەبات، چەندین ڕێبوار و نەشارەزای ون کردووە... باریکەڕێیەکە لەنێوان دوو ترۆپکەوە، بە چەند پێچێ بەرەو ئەودیو ئەچێت، پاش سەعاتەوەختێک، مرۆڤ دەگەیێنێتە سەر کانیاوێکی سارد، کە لەنێو ئەشکەوتێکی ڕەشداگیراودا هەلدەقولێت، هەر بیست مەترێک لە خوارووی ئەشکەوتەکەوە، ئاوی کانییەکە، بە نێو بەردەلان و پێچەکاندا، گاهێ وەک نیمچە تاڤگە، گاهێ وەک جۆگەی خوڕ دادەکشێت و بەرەو خوار دەبێتەوە...

(ئێستا) گەر کەسێک، لەم ڕۆژەدا، باریکەڕێیەکە بگرێت و بەرەو زنجیرە چیا سەخت و ڕووتەکەی لای پشتمەوە بکەوێتە ڕێ، بچێتە لووتکە هەرە بەرزەکەی، کە ناوی کەلکی شەیتانە، لە پایینی لووتکەوە وردە وردە بەرەو ئەودیو داکشێت و بگاتە سەر کانیاوەکەی (ئەشکەوتە ڕەش) لە پێچێکدا بەرەو لای چەپ، باریکە ڕێیەکە هەنگاوەکانی بەرەو نیمچەدۆلێک دەبات، یەکسەر کەسەکە، دووکەلی سۆپای سێ کوێرەمال دەبینێت، وەک هەناسەی دانیشتووانی، بەرەو ئاسمان و عەرشی خواوەند دەچن، شکایەت لە زولم و جەوری سەردەم دەکەن، مالەکان پالیان بە یەکەوە ناوە، تەنانەت هەناسەی کلۆلی و کەساسیشیان تێکەلە... یەکەم مالی ئەمسەریان - گەر کەسەکە بەوردی سەرنجی بدات، دەبینێت - پەرژینێکی ئەستووری هەند بەرز بووەتەوە، کەوانەی... گەر کەسەکە لەو کاتەدا بەختەوەر بێت، ئەوا ڕەشپۆشێکی کەلەگەتی شەرمن و چاوڕەش و پرچدرێژ، بە تەنەکەیەکەوە خۆی دەهاوێتە نێو دیدەی، با بەرەو (کانی چاوان) هەنگاو دەنێت، با لە ئاو هێنان دەگەڕێتەوە، بێ ئەوەی کەسەکە قسە بکات، یەکسەر کچە ڕەشپۆشەکە، ماندوونەبوونی دەکات، بە ڕوویەکی گەشەوە فەرمووی لێدەکات.

خۆ ئەگەر کەسەکە پێشمەرگە بوو، ئەوا گەرمتر فەرمووی لێ دەکات، خۆ ئەگەر فەرمووەکەی قەبووڵ کرد و چووە ماڵێ، ئافرەتێکی پەنجا ساڵەی ڕەشپۆش دەبینێت، لەنێو جێیەوە بە نووزەییەکەوە بەخێرهاتنی دەکات... خۆ ئەگەر کەسەکە لەوێدا بمێنێتەوە، لە دەمەو ئێوارەدا دوو کوڕ بەگەرمییەوە بەخێرهاتنی دەکەن، یەکێکیان تەمەنی حەڤدە ساڵە و ئەوی دییان مێردمناڵە، ئیدی کەسەکە دەکەوێتە بەر نەشتەری پرسیاری لەسەریەکی کچە و هەر دوو کوڕە، کچە ڕەشپۆشەکە زیاتر بەپەرۆشەوە پرسیار دەکات:

- زۆر بەخێر بێیت... دەنگوباسی ئەودیو چییە؟ پێشمەرگەکان چۆنن؟

ئەرێ ڕزگار دەناسی؟ لە تیپەکەی کاک مەحمودە، ئەرێ وەزعیان چۆنە؟ میوانەکە هەر وەڵامی باتەوە، سەمتی باسەکە هەر دەچێتەوە سەر ئەوەی، کە چۆن باسەکە بۆ ئەوە دەبات، کە چۆن باوکی لەگەڵ حاجی محیدینی موختار کوژدا دەکەونە نێو بۆسەوە، گەمارۆ دەدرێن، بۆ ئەوەی نەکەونە بەردەستی دوژمن، ناچار خۆیان دەکوژن، پاشان (عەسکەرەکان دەیانخەنە ژێر زنجیری دەبابەوە، ئەگەر کەسەکە لەگەڵ باسی کچەکەدا تێکەڵ بێت و سۆزی هەبڵچێت، ئەوا باسی ئەوەت بۆ دەکات، کە هەشت ساڵ لەمەوبەر چۆن، لە بەربەیانێکدا (عەسکەرەکان) هاتن و گوندەکەیان سووتاند... باسی ئەوە دەکات، کە خەڵکی گوندەکەیان چۆن تەعویزیان وەرگرت، تەنها باوکی ئەم نەبێت، کە پێیان گوت: (هەموو سەروەتی دنیام بدەنێ، یەک دارگوێز، یەک چڵ هەنار، یەک هەرمێ نافرۆشم، تەنانەت زرەتوویێک بە هەموو سەروەتی دنیا نادەم، بەهەشتم لێ تاپۆ بکەن نامەوێت، کەلاوەییەکی ئەم دێیە، ئەم دۆڵ و چیایە، بە هیچ شتێک ناگۆڕمەوە.

ئەوجا کچەکە دێتە سەر ئەوەی چۆن گوندەکەیان سووتاند، کانیاوەکانیان تەقاندەوە، ڕەنگە چەند جارێکیش بڵێ: (ئەوسا من دە ساڵان بووم، نەمدەزانی بۆ وامان لێدەکەن، هەر ئەوەندەم دەبیست... لەبەر ئەوەی کوردین، بۆیە وامان لێدەکەن.

باوکم وەک هیچی نەفرۆشت و تەعویزی وەرنەگرت، بە ئاسانیش دێی چۆڵ نەکرد، مەگەر ئەو خوایە بزانێت تا پاش ئەوەی ئێمەی دەرباز کرد - چەند عەسکەری داگیرکەری کوشت.

ئەڵبەتە کەسەکە نازانێت ئەم کچە ڕەشپۆشە ناوی (جوان)ە بەر لەوەی باوکی لەگەڵ باوکی مندا شەهید بن، مارەی لە مەحمودی برام براوە، دەبا لە بەهاریشدا بگوازێتەوە... کەسەکە نازانێت، (جوان) چەند بە جورئەتە، چۆن بە ئەوپەڕی ڕاشکاوی لە ڕووی ئامۆزاکانیا وەستا و پێیانی گوت:

(من شوو بە ئێوە ناکەم... من شوو بە پێشمەرگە دەکەم... باوکم و ڕزگاری برام پێشمەرگەن... فەرموون ئێوەش ببن بە پێشمەرگە... سەد کچی وەکوو من ئاواتەخوازن شوو بە پێشمەرگە بکەن)...

ئەڵبەتە (جوان) گەلێک شەرم دەکات، نایەوێت باسی ئەو عەشقە بێدەنگەی خۆی لەگەڵ مەحمودی برامدا بکات، کە چۆن لەو سەرنجەوە دەستی پێکرد، کە ڕزگاری برای بریندار بوو، هاتە سەردانی، مەحمودی دەبینی چۆن نان و ئاو دەکاتە دەمی و چۆن کراسە خوێناوییەکەی بۆ شۆرد.

گەر کەسەکە بشزانێت، ئەمڕۆ مەحمود شەهید بووە، ناتوانێت ئەم هەواڵە ناخۆشەیان بداتێ...

ئەڵبەتـە کەسـەکە نازانێت هـەر ئەمشـەو ئـەم هەواڵـە جەرگبڕەیـان دەگاتێ، من بڕیاری ئەوەم داوە هەر ئەمشەو، ئەو ڕێیە سەختە دەبڕم، دەگەمە ئەوێ، چ شتێک ناڵێم، تفەنگە میراتییەکەی مەحمودی دەدەمێ، لێدەگەڕێم، با خوێنی سەر قۆناغەکەی بێتە زمان و بڵێ:

- (جوان...

فەرموو ئەمە تفەنگ، ئەوەش مەیدان.)

١٩٨٥
سەرگەڵو